ئەحمەد حەمەد ئەمین هۆمەر

# ڕەواندز

## لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی - سیاسی

( ١٩١٨- ١٩٣٩ )



سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستان

## سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

دەزگایەکی کەلتورییە لەساڵی ١٩٩٢دا دامەزراوە، ئامانجەکەی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زانستییە لەبوارەکانی ئاسایشی نەتەوەییو سیاسەتی نێو دەوڵەتانو ئابوریو مەسەلە ستراتیجییەکانو مەبەستی بەدەست هێنانی قازانجی ماددی نیە.

هەمو ئەو لێکۆڵینەوانەی کەسەنتەر دەریاندەکا، گوزارشت لەڕاو بۆچونی خاوەنەکانیان دەکەنو بەپێی پێویست گوزارشت لەڕاو بۆچونی سەنتەر ناکەن.


- ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر
- ڕەواندز لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسی (١٩١٨-١٩٢٩)
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان.
- سلێمانی ٢٠٠٦.
- ژمارەی سپاردن (٤٧٠)ی ساڵی ٢٠٠٦.
- ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی سەنتەر: ٦/٤٠/٧

## پێشەکی

لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە نێوان ساڵانی(١٩١٨-١٩٣٩)، وەك ماوەیەکی مێژوویی دیاریکراو، کە بە کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکاتو بە سەرهەڵدانی جەنگی دووەمی جیهانی کۆتایی دێت، گرنگو پڕ بایەخە. چونکە لەو سەردەمەدا، ڕەواندز وەکو پێگەیەکی سیاسیی دەبوژێتەوە کە تاوەکو ئێستاکە ئەوەی لە بارەیەوە نووسرابێت پچڕ پچڕە و ناواخنی ڕووداوەکانی باس نەکراوەو وەکو پێویست پەردە لە سەر لایەنە شاراوەکانی هەڵنەدراوەتەوە. بۆیە دەکاریٚ ئەم هۆکارە، بە پلەی یەك دابنرێت لە ڕووی خۆ تەرخان کردن بۆ توێژینەوە لە مەڕ ناوچەی ڕەواندز و مشتومالکردنی ئەو زانیارییە مێژووییانەی دەربارەی تۆمارکراون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بایەخدانی تورکەکان بە ڕەواندز و کردنی بە پێگەیەك بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتەکەیان بە سەر ویلایەتی مووسڵ دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە لایەكو بە ماف زانینی بریتانییەکان بە دەسەڵاتیان بە سەر ناوچەکە و هەوڵدان بۆ بەستانەوەی بە دەوڵەتی تازە دروست کراوی عیراق لە لایەکی دی، خاڵێکی دیکەی سەرنج ڕاکێشە. ئەوە سەرەڕای هۆکارێکیتر، کە

بریتی‌یە لە دەرکەوتنی ژمارەیەك کەڵە پیاوی ناودار لە ناوچەکە لەو ماوەیەدا، وەکــو (نووری باویل ئاغا، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی، سەید تەهای نەهری، ئەمین ڕەواندزی و مەعروف چیاووك...) کە هەر یەکەیان بە هەڵوێست و کارەکانیان دوژمنیان سەرسام کردووە. ئیتر بۆ لە نەبان دابڕینی سەرجەمی ئەو ڕاستییانە، ئەم ئەرکەمان گرتە ئەستۆ.

شیاوی باسە بۆ مەبەستی بە ئەنجام گەیاندنی کارێکی وا زۆرێك ئاستەنگ دێنە پێشەوە، کە ڕەنگە لە هەندێك کات توێژەر سارد بکەنەوە، لە هەمووشیان گرنگتر دەرەنگ دەست کەوتنی ئەو سەرچاوانەیە کە تەنیا لە کتێبخانەی تایبەتی هەن، چونکێ هەندێك لەوانەی کە خاوەنی کتێبخانەی تایبەتین و کتێبی دەگمەنیان هەیە، ئەوانە بە ڕای ئێمەمانان توشی نەخۆشی دەروونی و قۆرخکاری کتێبە دەگمەن و دانسقەکان هاتوون، بۆیە دەبێت زۆر زیرەکانە لەگەڵیاندا بدوێیت. هەروەها یەکێك لە ئاستەنگەکانی‌تر، دەرگا بە ڕووداخستنی ئەو کەسانەیە کە شتێك لە بارەی ڕووداوەکانەوە دەزانن و نای درکێنن‌و ئامادەنیین هیچ شتێکت بۆ بڵێن. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هۆکارانە ماوەیەك کاریگەری خۆی کردووە، کە هەندێك وردەکاری لە شوێنی شیاوی خۆی باسی لێوەنەکرێـت، کەچی بە تەواوەتی نەبۆتە هۆی کاڵ‌و کرچی ئەو بەرهەمە کە لە پێشەکی‌و دەروازەیەك و سێ بەش‌و ئەنجام پێك دێت.

دەروازە کە سێ تەوەرە لە خۆی دەگرێت تیایدا باس لە ڕەگ‌و ڕیشەی ناوی ڕەواندزو شوێنی جیۆگرافی‌و ڕەوشی کۆمەلاّیەتی‌و

ئابووری‌و کارگێڕی‌و سیاسیی ڕەواندز، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم دەکەین.

بەشی یەکەم کە لە دوو تەوەرە پێك هاتووە باس لە ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە نێوان ساڵانی(١٩١٨-١٩٢٣) دەکەین، لە بەر ئەوەی لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٨ دەسەڵاتی داگیرکاری بریتانی دەستی بە سەر ناوچەکەدا گرت‌و تا ڕادەیەك باری ناوچەکە بوژایەوە، بەڵام ئەو بارودۆخە درێژە ناکێشێت‌و خەڵکی بە ڕووی سیاسەتی بریتانییەکان لە ناوچەکە هەڵدەگەڕێنەوە‌و وەدەریاندەنێن، لە بەر ئەوەی سیاسەتی ئینگلیزەکان بریتی بوو لە سیاسەتی چەوساندنەوە‌و ئاگر خۆشکردنی دووبەرەکی لە ناوچەکە، ئەگەر بزانیین توانیویانە تۆوی ئەو دووبەرەکییە لە ناوچەکە بچێنن‌و دوژمنداری لە نێوان دوو بنەماڵەی بە ناوبانگی ڕەواندز گەرمتر بکەن‌و بۆ نەوەکانیان بە جێبهێڵن. هەروەها هەر لەو بەشەدا، باس لە دووبارە هاتنەوەی دەسەڵاتی داگیر کاری تورکەکان دەکەین، کە لە سەر داواکاری خەڵکی ناوچەکە هاتونەتەوە‌و لە دواتریش ڕۆڵی کاریگەریان بینیوە لە پروپاگەندەکردنی ئەوەی کە دەسەڵاتیان بۆ گشت ولایەتی مووسڵ دەگەڕێتەوە، بەڵام سەرئەنجام تورکەکان لەو هەوڵانەیان سەرکەوتوو نەبوون‌و لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ لە ناوچەکە کرانە دەرەوە.

بەشی دووەم کە تایبەتە بە ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە نێوان ساڵانی( ١٩٢٣-١٩٣٩)، لە سێ تەوەرە پێك هاتووە. لە تەوەرەی یەکەمدا، باس لە ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە ساڵانی ئینتیدابی بریتانی دەکەین‌و لە تەوەرەی دووەمیش، ساڵانی قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقی کە لەو قۆناغەدا ڕەوشی ڕەواندز لە سەرچاوە

مێژووییەکاندا دەکەوێتەوە کزی، بۆیە بۆ چەند هۆکارێکی دەبەینەوەو یەکە یەکە لە سەریان دەوەستینو باسیان لێوە دەکەین. لە تەوەرەی سێیەمیشدا، ئاماژە بۆ ڕۆڵو چالاکی ڕەواندزییەکان دەکەین لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی، بە تایبەت ڕۆڵی (عەبدوڵڵا موخلێس بەگ، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزیو مەعروف چیاووك) لەگەڵ هەڵوێستی خەڵکی ناوچەکە لە بەرانبەر چالاکی هەندێ لە ئەندامە کوردەکان لەو ئەنجومەنە.

بەشی سێیەم تایبەت کراوە بۆ باس کردنی ڕۆڵ و چالاکی ڕەواندزییەکان لە کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردی و عیراقییەکان لە قۆناغی داگیرکاری بریتانیو قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقیدا، کە ژمارەیەکی زۆر کۆمەڵەو ڕێکخراو بە نهێنیو ئاشکرا هاتنە دامەزراندنو ڕەواندزییەکان ڕۆڵی کارایان تیادا بینیوە.

ئەنجام لە وێدا ئاماژە بۆ گرنگترین خاڵە ئەنجامگیرییەکانی توێژینەوەکە کراوە.

بۆ ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە پشت بە ژمارەیەك سەرچاوە و بەڵگەنامە بەستراوە. لەوانە هەندێ لە ساڵنامەکانی ولایەتی مووسڵ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی کە وەکو چاپکراوی فەرمی پشتیان پێبەستراوەو زانیارییەکانی پشت ڕاستکردۆتەوە کە ئەمانەش بۆ بەشی یەکەم بە کەڵك بوون. هەروەها نووسینەوەی یاداشتو گێڕانەوەی ڕووداوەکان لە لایەن ئەو کەسانەی کە هاوبەشو هەڵسوڕێنەری هەندێ لە کارەکان بوون جێگای گرنگیو سوودبوون، لەگەڵ ئەوەی کە دەبێت بە وریایەوە مامەڵە لەگەڵ هەندێ لە زانیارییەکانیاندا بکەیت، چونکێ لە هەندێکیاندا زانیاری شاردراوە و پیاداهەڵگووتنی

زیاد لە پێویستی تیایە. لێرەشدا ژمارەیەك لەو یاداشتانە بۆ ئەو باسە سوودی لێ وەرگیراوەو لە هەندێ کات بە هۆی نەبوونی زانیاری لە سەرچاوە تایبەتەکاندا، بە ناچاری چەند جارێك لە پەڕاوێزەکان دووبارە کراونەتەوە بۆ پشت ئەستورکردنی زانیارییەکانی نێو باسەکە، وەکو: (یاداشـــــــــت)ی ڕەفـــیق حلمی (١٨٩٨-١٩٦٠)، (سنتان فی کردستان)ی دبلیو: أر. هی،(خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقی)ی جەلال تەقی، (کورد تورك عەرەب)ی ئیدمۆندس، (طریق في کردستان)ی هاملتون، (بیرەوەریەکانی عەلی باویل ئاغا)ی عەلی باویل ئاغا (١٩٠٤-١٩٩٢) لە سەر کاسێت تۆمارکراو. هەروا کتێبی( تاریخ الوزارات العراقیة)ی مێژوونووسی دیاری عیراق عەبدوڕەزاق حەسەنیی، بەرگەکانی( یەکەم، دووەم، سێیەم) جێی بایەخ بوون، ئەگەرچیش ناوبراو لە زۆر شوێندا، بە ئینسافەوە خامەی لە خزمەت گەلی کوردا نەخستووەتە کار. بەرگی یەکەم و دووەمی (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد)ی دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، دوو بەرگی(شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان)ی محەمەد ڕەسول هاوارو بەرگی یەکەمو دووەمی (المجلس التأسیسي العراقي) دوکتۆر محەمەد موزەفەر ئەلئەدهەمی هیچی لە وانەیتر کەمتر نییە، لە بەر ئەوەی زانیارییەکانی نێو ئەو سەرچاوانە ئەکادیمین‌و بە بەڵگەو دیکۆمێنت دەوڵەمەندن. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشدا ژمارەیەك بەڵگەنامەی بڵاونەکراوە و بڵاوکراوە سوودیان لێوەرگیراوە کە سیانیان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە لە پەراوێزی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی لۆزان( ١٩٢٣) دەسەڵاتدارانی تورکیاو بریتانیا گرنگییان بە ناوچەکە بە گشتیو ڕەواندز بە تایبەتی

داوه، له بەر ئەوەی زۆرێك گفتوگۆو مشتومڕی خستۆته نێوانیانەوه و هەر یەکەیان به مافی ڕەوای خۆی زانیوه که دەسەلاتی له ناوچەکەدا هەبێت. ماوه بلێین نابێت سوودمەندی (مێژووی میرانی سۆران)ی حوسێن حوزنی موکریانیو هەندێ له بەرهەمەکانی که ئێستاکه له ژێر چاپدانو له لایەن دوکتۆره کوردستان موکریانی ئامادەکراون باس نەکەین. ئەوه سەرەڕای گۆڤاری زاری کرمانجی که وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی مێژوویی ئەو سەردەمەی ڕووداوەکانی کوردستان به گشتیو ڕەواندز به تایبەتی بۆ تۆمارکردووینو بۆ ئێمه جێگای بایەخ بووه. ئیتر ئەمانەو ژمارەیەك سەرچاوەیترو دیمانەی تایبەت یارمەتیدەری به هێز کردنی زانیارییەکانی نێو ئەم باسەن، که له ڕیزبەندی سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کراوه.

دیاره ئەم لێکۆڵینەوەیه له هەڵەو کەمو کورتی به دوورنییەو، کونو کەلێنی تیادانو تێبینیو ڕەخنان له خۆ دەگرێت، له بەر ئەوەی هەر کارێکی لەو جۆره کالاّی کەماڵی به بالاّ نابڕدرێتو دەخوازم ڕەخنه ئاژەن بکرێت، بۆ ئەوەی هێزو پێزی زیاد بکاتو بگات به ئاستێکی بالاّترو لافی لێکۆڵینەوەیەکی خزمەتکار بۆ مێژووی میللەتەکەمان لێ بدات. سەرکەوتنو سەرفرازییش له خواوەیه.

توێژەر

## تەوەری یەکەم

# ڕەگ و ڕیشەی ناوی ڕەواندز و شوێنی جیۆگرافیی

ڕەگ و ڕیشەی ناوی ڕەواندز لێکدانەوەو بیروڕای جیاواز لە خۆی دەگرێت. سەرەتا هەندێکیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە دوو وشەی (ڕەوەند+ دز) پێك هاتووە، ئەمەش دەگێڕنەوە بۆ نێوی خێڵی ڕەوەندی کە نیشتەجێی ناوچەکە بوون، دزیش بە مانای قەلاَ دێت، واتە قەلاَی خێڵی ڕەوەندی بووە و بە تێپەڕبوونی کات سواوە بۆتە ڕەوەنددز- ڕەواندز[1]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی‌تردا هەندێکی‌تر سەرچاوەی ناوی ڕەواندز بۆ (ڕویین دژ) دەگێڕنەوە کە بە مانای قەلاَی پۆلاَیین دێت، هەڵگرانی ئەو بیروڕایەش ئەو دێرە هۆنراوەیە دەکەن بە بەڵگەی بۆچوونەکەیان کە میر محەمەد پاشای ڕەواندزی (١٨١٣-١٨٣٦)[2] لە سەر یەکێك لە دەرگای کۆنگەرەکەی ڕەواندز نووسیویەتی ((دوکنگرم رانهام برد و پیکر( رواندز) شد ( روین دژ) باردیگر)) واتا

---

(١) شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار، چاپخانەی نعمان، نەجەف، ١٩٧٢، ل٤٨٥؛ طه باقر و فؤاد سفر، المرشد إلى مواطن الآثار و الحضارة الرحلة الخامسة بغداد - اربيل، بغداد، ١٩٦٦، ص٢٤؛ جەمیل ڕۆژبەیانی، ((ڕەوەنددز)) ڕاستە، نەك (( ڕوئین دز))، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە(٦٧)، ١٩٩٤، ل١٥.

(٢) بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی بڕوانە: جمال نەبەز، الأمير الكردي مير محمد الرواندزي الملقب ب((میری کوێرە))، ترجمة: فخري شمس الدين سيلاحشۆڕ، دار ئاراس للطباعة ء النشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٣.

دووبـــرجم بيناكـــــرد له سەر دوو بنـــــەما ڕەوانـــدز دیسانەوە بووە بە قـــەلأی پـــۆلأییــن( ڕويين دژ)[٣].

کەچی لە لايەکی دیکەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ڕەواندز لە دوو وشەی ڕەوان يان ڕەهوان+ دز پێك هاتووەو مانای شوێنی حەوانەوە دەبەخشێت، بە تايبەت ڕەوەندەکان لە کاتی هاموشۆکردنيان لە گەرميانو کوێستانەکان کردويانەتە وێستگەی حەسانەوەيان[٤]. هەروەها محەمەدی مەلا کەریمیش ئاماژە بۆ بیرورایەکیتر دەکاتو دەڵێ: "... **سەرەڕای ئەمە ئەشکرێ ئەگەر ( ڕوواندز) ڕاستر بێ لە(ڕەواندز)، بە واتای (قەلأی ڕووان) بێ واتە (قەلأی چەمان)، واتە ئەو قەلأیەی کەوتووەتە سەرچەم، چونکە (ڕۆ) لە کوردیا بە مەعنای چەم زۆر بە کاردێ...، ڕەواندزیش چۆمێکی گەورە بە نزیکیا ئـــەڕوا**"[٥].

ماوەبلێین لە بیرورایەکیتردا ئاماژە بۆ ئەوەش کراوە کە لە پێشدا بە ڕەواندز وتراوە (گردڕەوەند)، لە بەر ئەوەی خێڵە کۆچەرییەکان هاوينان تێدا کۆدەبوونەوەو وەکو کوێستانێك تيايدا دەحەسانەوەو مەڕومالأتيان تێدا دەلەوەڕاند، بەلأم بە هۆی پەیدابوونی دزو جەردە

---

(٣) حسێن حزنی موکريـانی، مێـژووی میرانــی ســۆران، چــاپی دووەمــيين، چـاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٢، ل٢٨؛ سەيد عەبدوڵلای ســەمەدی، وشــەی ڕەوانــدز، گۆڤاری سروە، ژمارە(٨١)، ١٩٩٣ ، ل ١٩؛ محمدی مەلا کەریم، لە بــارەی ریشــەی ناوی(( ڕەواندز ))ەوە، گۆڤاری ڕەنگين، ژمارە(٧٠)،١٩٩٤، ل١٤.

(٤) جمال بابان، أصول أسماء المدن و المواقع العراقية، الجزء الأول، مطبعة المجمع العلمي الكردي، بغداد، ١٩٧٦، ص١٨٦.

(٥) محمدی مەلا کەریم، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥.

لە ناوچەکەو دزینی مەڕومالاّتێکی زۆر لە ڕەوەندەکان ناوەکە گۆڕاوە بۆ ڕەوەنددز دواتریش ڕەواندز[٦].

لێرەدا دەتوانرێ بووترێ، کە ئەو بۆچوونەی دوایی کە ناوی ڕەواندز بۆ گردڕەوەند دەباتەوە لە ڕاستییەوە دوورە، لە بەر ئەوەی ڕەواندز هێندە شوێنێکی کوێستانی نییە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ناوچە سنوورییەکانی ئێران و تورکیادا، تا ڕەوەندەکان هەوارگەی کوێستانیان لێدامەزراند بێت. هەروەها ئەوەش ناچێتە ئەقڵەوە کە دز ئەوەندە بە توانا بووبن وایان لە ڕەوەندەکان کردبێت تەنانەت نێوی گردڕەوەندیان پێ بگۆڕن بە ڕەواندز، چونکێ خاوەن ئاژەڵدارەکان بەردەوام چەك و تفاقی خۆیان پێ بووە تا بەرەنگاری دزو جەردەکانی پێبکەن چ جا هەموو ساڵێك دووبارە بووبێتەوە. هەمیسان بۆ چوونەکەی محەمەدی مەلا کەریمیش ڕەت دەکەینەوە، چونکێ خۆشی بە گومانەوە باسی لێوە دەکات. سەبارەت بەو بیروڕایەی کە ڕەواندز بە شوێنی حەوانەوە یاخود وەك وێستگەیەك لێك دەداتەوە، ئەوە وادەگەینێت کە ڕەواندز تەنیا ماوەیەکی کاتی جێگای نیشتەجێبوون بووە، ئەگینا ماوەکانیتر بەردەوام چۆڵ بووە. ئەمەشیان ڕەت دەکرێتەوە ئەگەر بزانیین لە سەردەمانێکی زۆر زووەوە ئەو ناوچەیە مۆڵگەی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ بووە[٧].

---

(٦) ئەمین چاوڕەش ڕەواندوزی، ناوی ڕەواندز لەچییەوە هاتووە..؟، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە(٣٣)، ساڵی ١٩٩١، ل١٩.

(٧) طه باقر و فؤاد سفر، المصدر السابق، ص٢٤؛ زبير بلال إسماعيل، اربيل في أدوارها التاريخية دراسة تاريخية عامة لاربيل و أنحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى، مطبعة النعمان، النجف الأشراف، ١٩٧١، ص٢٥٤؛

شیاوی باسە ئەوانەی ڕیشەی ناوی ڕەواندزیش بۆ( ڕویین دژ) دەگێڕنەوە ئەوانیش کەوتوونەتە هەڵەوە، لەبەرئەوەی ڕویین دژ دەکەوێتە هەرێمی ئازەربیجان نزیك بە تەورێزەوە[8]. بۆیە دەتوانرێ بووترێ کە ڕەواندز لە هەموویان ڕاسترە، چونکێ شوێنی نیشتەجێ بوونی خێڵی ڕەوەندەکانی دەورانی هۆزی هەزبانیو حەمێدیین کە فەرمانڕەوایی هەرێمێکی فراوانیان لە ژێر قەڵەمڕەودا بوو، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کۆچەریش بوون بەردەوام خاوەن قەڵای تۆکمە و بەهێز بوونو سەربەخۆیی خۆیان پاراست بوو، تا عیمادەدین زەنگی (١١٢٧-١١٤٦) ئەتابەگی مووسڵ[9] بە ناوی برایەتیو موسڵمانیەتی، سەردارانی کوردی تەفرەداو هەموو قەڵاکانی داگیرکردن[10].

سەبارەت بە هەڵکەوتەی شوێنی جیۆگرافی ڕەواندز ئەوا دەکەوێتە نزیك سێ گۆشەی سنووری عیراق ئێران تورکیاوە، لە سەر هێڵی پانی (٣٧)و هێڵی درێژی(٤٤) بە نزیکەی ١٠٠٥ مەتر بەرزی لە ئاست ڕووی دەریاوە، کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتییەوە شاری ورمێو شنۆیەو لە

---

Thomas Bois, The Kurds, Translated by: Prof.W.M.Welland, Beirut, 1966,P9.

(٨) ياقوت الحموي( الشيخ الامام شهاب الدين ابي عبدالله ياقوت بن عبدالله الحموي الرومي البغدادي توفي ٦٢٦هـ ١٢٢٨م)، معجم البلدان، المجلد الثالث، دار بيروت صادر، بيروت، دون سنة الطبع، ص ١٠٥؛ ابن الأثير( عزالدين ابي الحسن بن عبدالكريم الجزري توفي٦٣٠هـ/١٢٣٢م)، الكامل في التاريخ، المجلد الثاني العشر، دار صادر للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٦٦،ص ٤٩٣.

(٩) بۆ زانیاری زیاتر لە سەر عیمادەدین زەنگی بڕوانە: عمادالدين خليل، عمادالدين زنكي، مطبعة الحديث، الموصل، ١٤٠٦هـ/١٩٨٥م.

(١٠) جەمیل ڕۆژبەیانی، لە بارەی ڕوئین دژ و دزدانەوە ڕوونکردنەوە، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە( ٧٣)، ١٩٩٤، ل٦.

ڕۆژهەڵاتیشی شاری مەهابادەو، لە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری هەولێرەوەیە، کە لە هەر چوار لایەوە بە شاخ و زنجیرە چیا دەورەدراوە. لە باکوورییەوە زنجیرە چیای زۆزگ و حەسەن بەگ و برادۆست، لە ڕۆژهەڵاتەوە چیای هندرێن و دۆڵی باڵەکیان، لە ڕۆژئاوادا گردێنەی باپشیان و گۆڕەزو چیای باڵەکیان و لە باشووریشدا چیای کۆڕەك و ئارموشە و بێجانییە. ئەو هەڵکەوتە جیۆگرافییەش وای کردووە بکەوێتە ژێر کارتێکردنی زۆر ئاووهەواوە بە تایبەت ئاووهەوای دەریای ناوەڕاست، بۆیە ئەگەر بێت و سەیر بکەین ڕەواندز لە زستاندا بەفرێکی زۆری لێ دەبارێت و پلەی ساردی دێتە خوارەوەو، لە هاوینیشدا ئاووهەوایەکی فێنکی هەیە[11].

شیاوی باسە ئەوەی زێتر جوانی بە ڕەواندز دەبەخشێت ئەوەیە کە دەکەوێتە نێوان دوو دۆڵی گەورەو قوڵ کە بە ڕاست و چەپی ڕەواندز تێپەڕ دەبێت و شارەکە دەخەنە نێوەڕاستیانەوە، کە ئەوەی ڕۆژهەڵاتی پێی دەوترێت خەرەندو هی ڕۆژئاواش گەلی[12]. بەلاّم دەبێ ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین، کە ڕەواندز بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی لە شوێنی

---

(11) عەقیلە ڕواندزی، وەبیرم دێنۆ، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٩؛ محسن حەسەن، رواندز لە روانین دا ، گۆڤاری روانین، ژمارە (١) ، رانیە، ١٩٩٨،ل ١١٥.

(١٢) بدره صلاح، شاری ڕەواندز، گۆڤاری هیوا، ژمارە( ٩)، سالّی١٩٥٨، ل٥؛ چەتۆ احمد باس، ڕواندز دوێنێ و ئەمڕۆ، گۆڤاری ڕواندز، ژمارە(١)، نیسانی ١٩٩٨، ل ٣٠.

کاولۆکانی[13] ئێستا بووەو دوای کاولکردنی لە لایەن سوپای ڕووسەوە، هەڵکشاوە بۆ شوێنی ئێستاکەی[14].

گەلێك لە گەڕیدەو گەشتیاران یاخود مێژوونووسان لە نووسینەکانیان باسی ڕەواندز یان کردووە. ئەوەتە نیبور(١٧٦٥-١٧٦٦) گەشتێکی بە ناوچەکەدا کردووەو باسی ڕەواندز دەکاتو دەڵێ:" **ڕەواندز لە سەر چیایەکی سەخت ڕۆنراوە بە هەردوو لای دۆڵی بچکۆڵە هەیەو تاکە ڕێگایەك هەیە هەڵدەکشێ بۆ ناو شارەکە...**"[15]. (کلۆدیۆس جێمس ڕیچ )یش( ١٨٢٠) لە باسی ڕەواندز نووسیویەتی:" **ڕەواندز قەلاّی هۆزێکی سەربەخۆی کوردەو مستەفا بەگ فرماندەیە. ئەو قەلاّیە کەوتۆتە سەر کێوی زۆر بەرزی گەلی(زاگرۆس)و(زێ) لایەکیانی کەل کردووە لایەکەی تریشی لە هەندێ گەلیی زیاتر ڕێگەی وانزیکی تێدانییە و بۆ بەرگری کردنیش زۆر چاك قایمکراوە ...**"[16]. هەروەها عەبدوڕەزاق حەسەنیی لە وەسفی ڕەواندزدا، دەڵێ:" **بە یەکێك لە مەڵبەندە گرنگەکانی بازرگانی**

---

(١٣) کاولۆکان دەکەوێتە لای باکووری ڕۆژهەلاّتی ڕەواندزی ئێستا و لە دۆلاّییەك دایە.

(١٤) مەلا ئەسعەد خەیلانی، دەست نوسی مێژووی سۆران، ل ٣٤؛ ممدوح مزوری، بنەمالاّنی بە ناوبانگی رواندز، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨،ل ١٣٠.

(١٥) کارستن نیبور، رحلة نیبور إلی العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة: محمود حسین الآمین، بغداد، ١٩٦٥، ص ص ٧٥-٧٦.

(١٦) کلودیوس جێمس ڕیچ، گەشتنامەی ڕیچ بۆ کوردستان١٨٢٠، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٢٧٣.

دادەنرێت‌و بارەگای سەرکردەکانی کوردە، بە سەر هەموو خانووە بەرزەکانی دەورووبەری خەرەندو دۆڵ‌و سەختەنە سەیرە سروشتیەکاندا زاڵە، بە سەر کەرتە شاخێکدا پەرش‌و بڵاوبۆتەوە، کە لە چیای بەرزی کۆرەك دەبێتەوە تا دەگاتە لێوارێکی شاخی تەخت بە سەر ڕووباری ڕەواندزەوەو، بە تیژی بەرەو دۆڵەکەدا دەکشێ‌و، لە نێوان دوو دیواری بەرزو بە سامی شاخدا دەڕوات، سەرچاوەی ڕووبارەکەی بۆ کانییەکانی چیاکانی دەوروبەرو کانییەکانی نزیك بە شار دەگەڕێتەوە..."(١٧).

بەو شێوە دەتوانرێ بووترێ، هەڵکەوتەی جیۆگرافییەکەی ڕەواندز، گرنگی زۆری پێ بەخشیوە لە ڕووی مێژوویی‌و نیشتەجێ بوونی مرۆڤ لە لایەك‌و، لە لایەکی‌تریش لە ڕووی ئابوورییەوە، بە هۆی بوونی بەرهەمهێنانی بەرووبوومی چاك تیادا، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە لە کۆنەوە بۆ بازرگانی ڕووی تێکراوە و سوودی باشی بە خەڵکی ناوچەکە بەخشیوە کە لە تەوەرەی داهاتوو باسی لێوە دەکەین.

---

(١٧) عبدالرزاق الحسني، العراق قديماً و حديثاً، الطبعة الثالثة، مطبعة العرفان، صيدا، لبنان، ١٩٥٨،ص ٢٤٢.

# ڕەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ڕەواندز

سروشتی پێك هاتەی کۆمەڵایەتی ڕەواندز بەدەر نی‌یە لە سروشتی پێك هاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری، کە لە سەردەمانی کۆنەوە لە سەر بناغەی پاشماوەی بە هێزی هۆزەکی دامەزرا بوو، ئەو پەیوەندییە هۆزەکییەش نەك تەنیا دەستی بە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی کۆچەرەکانو نیمچە کۆچەرەکان داگرتبوو، بەڵکو دەستی بە سەر ژیانی کۆمەڵگا نیشتەجێبووەکانیش گرتبوو[18].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ژمارەیەکی جیاواز لەو هۆزانە دەکەن کە لە ڕەواندزو ناوچەکانی سەر بە ڕەواندز هەبووە[19]. بەڵام ڕۆلنسۆن هۆزی ڕەوادی بە گەورەترین هۆز لە هۆزەکانی ڕەواندز دەداتە قەڵەم، کە ئەمانیش دابەش دەکرێن بە سەر دوانزە بەرە: ماگیر، مام سام، مام ساڵ، مام باڵ، مامەکاڵ، مام سیل، مام لیس، مام سەکی،

---

(۱۸) محمد امين زكي، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان من اقدم العصور التاريخية حتى الان، ترجمة: محمد على عوني، مطبعة السعادة، مصر، ۱۹۳۹، ص ۲۹۰؛ د. شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، الطبعة الاولى، مطبعة شفيق، بغداد، ۱۹۷۳، ص ۱۵۰؛ جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: د.کاوس قەفتان، بغداد، ۱۹۸۷، ل ۲۷.

(۱۹) عباس العزاوی، عشائر العراق، الجزء الثاني(العشائر الكردية)، مطبعة المعارف، بغداد، ۱۹٤۷، ص ص ۱٤۲-۱۵۰؛ نيكيتن، مادة رواندیز رويندیز، دائرة المعارف الإسلامية، المجلد العاشر، ص ۲۰۰.

مامەخاڵ، مامویی، پیرباڵ، کەلو[٢٠]، هەروەها دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، جگە لە وەی کە دانیشتوانی ڕەواندز کوردن‌و موسڵمانن، بەڵکو لە تەك ئەمانیشدا هەندێ لە کەمایەتی مەسیحی‌و جولەکەش هەن[٢١].

شیاوی باسە ئەو پەرەسەندنەی کە ڕەواندز بە خۆیەوەی بینی، بە تایبەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی(١٨١٣-١٨٣٦)، لە دواتریشدا کاریگەری بە سەریەوە هەر دیاربوو، ڕەنگە بەشداری کردنی ژمارەیەکی بەر چاوی خەڵکی ڕەواندز لە ڕۆژنامەی" زەورا"[٢٢] کە بە زمانی عەرەبی‌و تورکی لە بەغدا دەردەچوو لە ساڵی ١٨٧٧ بە یازدە کەس‌و ساڵی دواتریش بە بیست‌و نۆ کەس شایەتحاڵی ئەوەبن کە ئاستی کۆمەلاّیەتی ڕۆشنبیری ڕەواندز لەو سەردەمە بەرز بووە[٢٣]. ئەوە لە لایەك، کەچی لە

---

(٢٠) جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل ٣٤.

(٢١) موصل ولايتی سالنامه رسمیسدر، ١٣٢٥هـ، موصل، ( مطبعة سند طبع اولنمشدر) ص ٢١٧؛ کامەران بابان زادە، میرنشینی سۆران لێکۆڵینەوەیەکە لە سەر مێژووی سیاسی میرنشینی سۆران سەرەتای سەدەی یازدەهەم- ١٨٣٦، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٧، ل ١١.

( ٢٢) ڕۆژنامەی ( الزوراء) ڕۆژنامەیەکی فەرمی بوو لە بەغدا ساڵی ١٨٦٩ بە هەر دوو زمانی عەرەبی و تورکی دەردەچوو، بەردەوام بوو تا داگیرکردنی بەغدا لەلایەن بریتانییەکانەوە. منير بكر التكريتي، الصحافة العراقية و اتجاهاتها السياسية و الاجتماعية و الثقافية من (١٨٦٩-١٩٢١م)، مطبعة الارشاد، بغدد، ١٩٦٧، ص ٥٢.

(٢٣) " زوراء" العدد( ٧٦٣) ، ٧جمادى الآخرة ١٢٩٥هـ ، ٨ حزيران، ١٨٧٨. لە: د.كمال مظهر أحمد، راي للمناقشة- الإطار الزمني لتاريخ العراق الحديث و

لایەکیتردا بەستانەوەی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە دەسەڵاتی ناوەندی جا چ لە ڕێگای پیاوەکانیانەوە بێت، یاخود لە ڕێگای سەرۆك هۆزەکانەوە بێت کاریگەری کردۆتە سەر دواکەوتوویی باری کۆمەڵایەتیو ئابووری ڕەواندز لە ڕێگای چەوساندنەوەو سەندنی باجو کاری بە زۆرە ملێ پێیان، چونکە بە گوێرەی قسەی شارەزایەکی کۆمەڵگای کوردەواری، لە سەر وەختی زاڵبوونی تورکان بەسەر ناوچەکانی میریدا، ئاغاکانیان کردە نێوەندی پەیوەندی گرتنی نێوان خۆیانو دانیشتووان. ئاکامی سروشتی ئەو کارەش خزمەتی بە سەقامگیرییو بەرزبوونەوەی پایەی ئاغاو خانەدانەکان کرد. ئیدی ئەو ئاغایە، دەسەڵاتی بە شێوەیەکی تایبەت وردە وردە بە سەر دانیشتووانی ناوچەکەیدا هەڵکشاوە. قسەی ئەو ڕەها بووە لە هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیی دانیشتوواندا. مسکێنیش لە بەر گەلێك هۆی تایبەتیو گشتی نەیتوانیوە حسێب بۆ دەسەڵاتی ئاغاو پیاوەکانی نەکات [٢٤].

لە ڕووی ئابوورییەوەش هۆزە کوردییەکان پشتیان بە بەرهەم هێنانی بەروبوومی کشتوکاڵیو بەخێوکردنی ئاژەڵداری بەستووە، کە تارادەیەك پێداویستییە ناوخۆییەکانی پڕدەکردەوە. بەڵام لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم بە هۆی سیاسەتی توند و

---

المعاصر، مجلة الحكمة، العدد الخامس، بغداد، تشرين الثاني- كانون الاول، ١٩٩٨، ص ٣٦. وەرگیراوە.

(٢٤) سیسل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورك عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەوەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢٧٤.

تیژی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێرانی ( قاجاری) لە لایەك و لە لایەکی دیکەش پێشکەوتنی بواری ئابووریی جیهان کاری کردە سەر ڕەوشی کۆمەلآیەتی ئەو هۆزانە، ئیتر بەرە بەرە هەنگاوییان بەرەو نیشتەجێ بوون نا[25]. ڕەواندزیش لە لایەك بە هۆی ئەوەی لە زووەوە بۆ بازرگانی ڕووی تێکراوە، لە لایەکی دیکەوەش بەروبوومی توتن‌و مێوەجاتی لێ بەرهەم هێنراوە گرنگی‌و بایەخی لە ڕووی ئابوورییەوە هەبووە[26]. ئەوە سەرەڕای بوونی هەندێ کارو پیشەی دەستی کە بۆ دەست ڕەنگینی دانیشتوانی دەڤەرەکە دەگەڕایەوە، وەك دروست کردنی شاڵ‌و شەپکی کوردەواری، هەروەها دروست کردنی چەك‌و تفاقی شەڕ کە سەروچاوەکەی بۆ سەردەمی فەرمانڕەوایی میر محەمەد دەگەڕایەوە[27]. ئەوەتە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە زۆربەی

---

(٢٥) د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبـــــدالله حسن زادە، بێ شوێنی چاپ، ١٩٧٣، ل ١٥١؛ د. عەزیز شەمزینی، جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، بڵاوکردنەوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٤٥.

(٢٦) فەیسەڵ دەباغ، شار و شارۆچکەکانی پارێزگای هەولێر( لە قامووسی ئەعلامی)ی( شەمسەدین سامی) دا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە( ١)، هەولێر، ١٩٩٨، ل ٩٩؛ لیژەك ژیگیل، گەڕیدە پۆڵۆنییەکان لە ساڵانی ١٨٠٠ەکاندا لە کوردستان، وەرگێڕانی لە سویدییەوە: ئەمجەد شاکەلی، (WWW.DENGEKAN.COM/04-06Amjad14.pdf) لە ئینتەرنێتەوە.

(٢٧) ا.م. مینتیشاشفیلی، کورد کورتەی پێوەندیی کۆمەلآیەتی- ئابووری ڕۆشنبیری و گوزەران، وەرگێڕانی، د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٥٧" عەلی باویل ئاغا، بیرەوەریەکانی عەلی باویل ئاغا، دیمانەیەکی تۆمارکراو لە سەر کاسێت لەگەڵ عەبدولرەقیب یوسف بە مێژووی ٢٩ی تەمووزی١٩٨٢، ڕەواندز.

ئەو هەشتا تۆپەی کە والی مووسڵ هەیبوو لە دەستکردی کرێکارانی ڕەواندز بوون، پێك هاتەی دروست کردنی ئەو تۆپانەش لە دەورووپشتی ڕەواندز دەردەهێنران[28].

ماوە بڵێین بوونی ژمارەیەکی بەر چاو لە خانوو، دوکان، مزگەوت، قاوەخانە، فڕن، حەمامو خان لە ڕەواندز لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم ڕادەی پێشکەوتنی ڕەوشی کۆمەلایەتیو ئابووری پێشان دەدات[29]. هەر بۆیە زاری کرمانجی لە وەسفی ڕەواندز نووسیوویەتی:"... **مەخلوق لە شەرقو غەربەوە بۆ کریارو تیجارەت دەهاتنە (ڕەواندزێ)... مەرکەزی عیلمو سنعەتو فەنو تیجارەت بوو ، مازو، گلوان، سنجکە، تووتن، گەزۆ، روون، خوری، مێوژ، هەنگوین، لە مێوەجاتی ترێ، خۆخ شفتالو [مەبەستی خۆخە – توێژەر]، هەنجیر، هەنار، سێو، گێوژ، بەلالوك ، قەیسیو**

---

تێبینی: عەلی باویل ئاغا خۆشی کاسێتێکی لە بیرەوەریەکانی تۆمارکردووە کە هەندێ زانیاریی جیاوازی لەوەی عەبدولڕەقیب یوسف تیایە و ئێمە هەردووکمان بەکار هێناوە واتە هەرسێ کاسێت، جا لەمەودوا ئەگەر ئەوەی لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف بەکار بهێنین بە بیرەوەریەکانی عەلی باویل ئاغا تۆمارکراو لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف ناوی دەبەین و ئەوەی تریان تەنیا بە بیرەوەریەکانی عەلی باویل ئاغا.

(٢٨) أنور المائي، الاكراد في بهدينان، موصل، ١٩٦٠، ص ٣؛ د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چینی کرێکارانی عێراق دروست بوون و سەرەتای بزوتنەوەی، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری، چاپخانەی دار الشؤون الثقافیة، العامة، بەغدا، ١٩٨٥، ل ل ٢٥٦-٢٥٧.

(٢٩) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سالنامة ولایت موصل، موصل ولایتی، ١٣١٢ هـ ، ص ٣١٨؛ موصل ولایتی سالنامە رسمیسدر، ١٣٢٥هـ ، ص ٢١٧.

**ئەنواعی میوەجاتی بە لەزەت‌و لەتیف‌و چاك‌و ئەرزان ئەوەند زۆربوون نە دەهاتە فروتن"[30].**

**ئەمانەی ئاماژەمان بۆ کرد ڕادەی گرنگی‌و پڕ بایەخی ڕەواندز لە ڕووی کۆمەلاّیەتی‌و ئابووری نیشاندەدات، کە ڕەوشی کارگێڕی‌و سیاسیش هیچی لەو کەمتر نەبوو، وەك لە تەوەرەی داهاتوودا بە تێرو تەسەلی لە بارەیان دەکۆڵینەوە.**

---

(۳۰) د. کوردستان موکریانی، زاری کرمانجی ۲۵/۵/۱۹۲٦-۲۳/۷/۱۹۳۲ یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری رواندز،چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ۲۰۰۲، زاری کرمانجی، ژمارە (۲)، سالّی، یەکەم، ۱۹۲٦، ل ۲.
تێبینی: لەمەودوا بە زاری کرمانجی و سەرچاوەی پێشوو ناوی دەبەین.

## ڕەوشی کارگێڕی و سیاسیی ڕەواندز

دوا بەدوای کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی لە ساڵی ١٨٣٦، ڕەسووڵ پاشای برای دەسەڵاتی ناوچەکەی بەڕێوە دەبرد[٣١]، بەڵام هەر زوو دەسەڵاتدارانی عوسمانی ڕەسووڵ پاشایان لە ڕەواندز لاداو موتەسەرڕیفێکی تورکیان لە شوێن دامەزراند[٣٢]. لە پاشاندا بارودۆخەکە گۆڕانکاری تێکەوت دوای ئەوەی مووسڵ لە ساڵی ١٨٧٩ بوو بە ویلایەتێکی سەربەخۆو، ڕەواندزیش وەکو شارۆچکەیەك کەوتە سنووری بازنەی قەڵەمڕەوی ئەو

(٣١) بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ سەردەمی فەرمانڕەوایی ڕەسووڵ پاشا بڕوانە: حسێن حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٩٢-٩٣

(٣٢) مەلا ئەسعەد خەیلانی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٤٢؛ حسێن حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٩٨.

تێبینی لێرەدا کاتێك ئەو دوو سەرچاوەیە کە تایبەتن بە مێژووی سۆران و باس لە دانانی دەسەڵاتی موتەسەرڕیفی تورك دەکەن لە ڕەواندز، دەبنە پاڵپشت بۆ ئەو مەزبەتەیەی کە سلێمان بەگی سیلاحشۆڕ( ١٨٧٥-١٩٣٦) لە دوای دروست بوونی حکومەتی عێراقی داوای ئەوەی کردووە کە ڕەواندز بکرێتەوە بە لیوا، لە بەر ئەوەی ناوبراو ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ڕەواندز لە ساڵی ١٢٦٠ کۆچی کە دەکاتە ١٨٤٤ ی زایینی واتە دوای نەمانی میرنشینی سۆران لیوا بووە. بۆ زیاتر زانیاری لەمەڕ ناوەرۆکی مەزبەتەکە بڕوانە پاشکۆی ژمارە ( ١ ) .

ویلایەتەوە لە سەنجەقی شارەزوور کە مەڵبەندەکەی لە کەرکوك بوو[33].

شیاوی باسە، پاش ئەوەی ڕەواندز لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە بوو بە قائیمقامنشین ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی دەهەزار کەس دەبوو، هەروەها هەریەك لە ناحییەکانی دێرە (هەریر)، باڵەك، برادۆستو شێروانی لە خۆ گرتبوو، کە ئەمانیش هەر یەکەیان لە لایەن بەڕێوەبەری ناحیە بەڕێوەدەبردرانو ژمارەیەکیش گوندیان لە ڕووی کارگێڕییەوە لە ناو بازنەی دەسەلاّت دابوو[34].

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ناوی ئەو قائیمقامانە دەکەن کە فەرمانڕەوایی ڕەواندزیان کردووە، حوسێن حوزنی موکریانی، ناوی بیستو یەك قائیمقامی هێناوە[35]، بەلاّم ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ ئەوە زانیاری پێچەوانەو کەم و

---

(٣٣) د. فاضل حسێن، کێشەی ویلایەتی مووسڵ لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی دبلۆماسیەتی عێراق- بەریتانیا- تورکیاو رای گشتی، وەرگێڕانی: محەمەد شاکەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خاك، سلێمانی،١٩٩٩، ل ١٠٧؛ د.ئازاد نەقشبەندی، کێشەی ویلایەتی موسڵ یان کێشەی نەوت؟، گۆڤاری مەتین، ژمارە ( ٥٧ )، تشرینی یەکەم، ١٩٩٦، ل٥.

(٣٤) لە سەرەتا ڕەواندز کە بوو بە مەڵبەندی شارۆچکە هەر سێ ناحیەی دێرە، باڵەك، برادۆستی لە خۆ گرتبوو، بەلاّم دواتر فراوان بوو شێروانیشی کەوتە سەر. فەیسەڵ دەباغ، کوردستان لە چاپکراوەکانی عوسمانلییەکاندا، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ل٣٢، ٣٧،٣٩،٨٢؛ عبدالرزاق الحسنی، رحلة في العراق او خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد، ١٩٢٥،ص ١٤٨؛ فیصل محمد الارحیم، تطور العراق تحت حکم الاتحادیین ١٩٠٨-١٩١٤، مطبعة الجمهور، موصل، ١٩٧٥،ص٤٧.

(٣٥) حسین حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠.

کوڕی لێ بەدی دەکرێ، لە وانە ئاماژە بۆ ناوی عارف حیکمەت بەگ ئالوسی دەکات گوایە لە ساڵی (١٣٠٨-١٣٠٩ )کۆچی کە دەکاتە (١٨٩٠-١٨٩١ ) زایینی لە ڕەواندز قائیمقام بووە، کەچی ساڵنامەی ویلایەتی مووسڵ لەو ساڵە دا ئاماژە بۆ ناوی ئیبراهیم ئەفەندی دەکات کە لە ڕەواندزێ قائیمقام بووە[٣٦]، بەڵام دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ئەو عارف ناوەی حوزنی ناوی دەبات لە ساڵی ١٨٩٢ لە ڕەواندز لەو پلەیە دابووە[٣٧]. هەروەها حوزنی باس لە بوونی قائیمقامیەتی عەبدوڵڵا موخلیس بەگ[٣٨]و نیهاد بەگ ناکات، کە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٠٦ و دووەمیان لە ساڵی ١٩١٢ لە ڕەواندز قائیمقام بووینە[٣٩]. بۆیە لێرەدا دەتوانرێ بووترێ، زانیارییەکانی نێو ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ زیاتر پشتی پێ دەبەسترێ، لە بەر

---

(٣٦) سالنامەی ولایت موصل، ١٣٠٨ھ،ص ١٢٨.

(٣٧) سالنامە ولایت موصل، ١٣١٠ھ، ص١٨٥.

(٣٨) عەبدوڵڵا موخلیس بەگ کوڕی ئەسعەد بەگ کوڕی ڕەسوڵ پاشایە لە ساڵی ١٨٥٩ لە بەغدا لە دایك بووە و لای مامۆستای تایبەتی خوێندوویەتی. لە دوای کۆچی دوایی باوکی ماڵەکەی دەباتە کەرکوك و لە قەڵەمی تەحریرات دادەمەزرێت تا دەبێتە بەڕێوەبەر. ساڵی ١٨٨٩ بە ناوی مەئموریەتی لێکۆڵینەوە دەچێتە کۆیە و ڕەواندز و لە پاشانیش لە چەند شوێنێك دەبێتە قائیمقام، لە وانە ١٩٠٦ لە ڕەواندز. لە ساڵی ١٩٢٤ دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی دامەزراندن و لە ١٩٢٥ بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەران ئیتر ماڵەکەی دەباتەوە بەغدا تا لە ساڵی١٩٤١ لەوێدا کۆچی دوایی دەکات. حسێن حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٠٥-١٠٦.

(٣٩) موصل ولایتی، سالنامە رسمیسدر موصل، ١٣٢٥ھ، ص٢١٦؛ سالنامە ولایت موصل، ١٣٣٠ھ، ص ٢٥٢.

ئەوەی هاوسەردەمن لە لایەك‌و، لە لایەکی‌تریش تایبەتمەندن بە نووسینەوەی ڕەوشی کارگێڕی ویلایەتەکە.

جێگای ئاماژە بۆ کردنە گۆڕینی ئەو هەموو قائیمقامە لە ڕەواندز سەرچاوەکەی بۆ خراپی مامەڵە کردنی قائیمقامەکان‌و بێزاری خەڵکی دەڤەرەکە دەگەڕایەوە، کە دەرئەنجامی ئەو گەندەڵییە کارگێڕییە بوو کە سەرجەم دەزگا کارگێڕییەکانی دەوڵەتی عوسمانی تەنیبۆوە[٤٠].

هەر بۆیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم جولأنەوەیەك یا ڕاپەڕینێکی چەکداری لە ناوچە کوردییەکان لە دژی دەسەلأتدارانی عوسمانی ڕووی هەڵگیرسابایە، ڕەواندزو ناوچەکانی دەورووبەری دەکەوتنە ژێر کاریگەرییەوە، ئەوەتە کاتێك شێخ عوبەیدوڵلأی نەهری(١٨٨٠-١٨٨١) دەستی بە شۆڕش کرد دژی دەسەلأتدارانی عوسمانی[٤١]، ناوچەکانی ڕەواندزیشی لە خۆ گرتووە، بۆیە یەکێك لە بەڵگەنامەکانی فەرەنسی ئاماژەی بۆ دەکات‌و دەڵێ:" **شاری ڕەواندز، کە ژمارەییێکی زۆری لایەنگیرەکانی سەرۆکی ڕاپەرییوەکانی تێدایە، بڕیاریدا یاخیبوونی خۆی ڕابگەیەنێ، وەختاییێك شەعبان پاشا، ژەنەڕاڵی لیوا نێردرا بۆ ڕەواندز بە خۆیی‌و سێ بە تالیۆنەوە، یەحیا بەگ ناوێك کە سەر بە کۆنە فییۆدالیتەی ناوچەکە**

---

(٤٠) جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ل ٥٤؛ کۆمەڵێك لە پسپۆران ، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی: حسێن عوسمان نێرگسەجاڕی و حسێن ئەحمەد جاف، دەزگای چاپ و بلأوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٣، ل٤٠.

(٤١) بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلأی نەهری بڕوانە: جەلیلی جەلیل، ڕاپەرینی کوردەکانی ساڵی ١٨٨٠، وەرگێڕانی: د. کاوس قەفتان، چاپخانەی الزمان ، بەغدا، ١٩٨٧.

**بوو دەگرێو، وەك پێیان ووتم ڕەوانەی بەغدای کردووە، لە سایەی شێلگیری ژەنەراڵەوە ئاشوبێکی نوێ لە ناو چوو"[٤٢].**

**کاتێکیش ئیتتیحادییەکان[٤٣] لە ساڵی ١٩٠٨ جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست ئەوەندەیتر کەوتنە گیانی نەتەوە نا تورکەکان بە گشتیو گەلی کورد بە تایبەتی. ئەوەتە یەکەمین کاری سلێمان نەزیف پاشا والی مووسڵ (١٩١٣-١٩١٥) گرتنو بەندکردنی سەعید بەگی کوڕی عەبدوڵلا پاشای ڕەواندزی[٤٤] بوو[٤٥]. هەروەها بۆ لێدانو بنەبڕکردنی جوڵانەوەکەی بارزان بەسەرکردایەتیی شێخ عەبدولسەلام بارزانی**

---

(٤٢) نەجاتی عەبدوڵلا، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەکانی فرەنسیدا( ١٨٧٩-١٨٨٢)، بلاوکردنەوەی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی. ن. ك)، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٦٦.

(٤٣) کۆمەڵەی ئیتتیحاد و تەرەقی کە لە سەرەتا ناوی کۆمەڵەی تەرەقی ئیتتحادی بوو لە ساڵی ١٨٨٩ لە سەر دەستی ئیبراهیم تیمۆ و بە هارکاری ئیسحاق سکوتی و عەبدوڵلا جەودەت و محەمەد چەرکەسی هاتە دامەزراندن بە ئامانجی چاککردنی باری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی. دواتریش بە کودەتایەك لە ساڵی ١٩٠٨ دەسەڵاتی گرتە دەست. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ئەو کۆمەڵە بڕوانە:

E.E. Ramsour, The young Turks: Perlude to the Revolution of 1908, Russell & Russell, Newyouk, 1957.

(٤٤) سەعید بەگ کوڕی عەولا پاشا کوڕی بەکر بەگ کوڕی بایز بەگی باپشتییە، بایز بەگ مامی میر محەمەد پاشای ڕەواندزییە. ناوبراو پیاوێکی کار بەدەست و دەوڵەمەندی ناوچەکە بووە، بەڵام دواتر لە ١٩١٨ بەر لە هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە کوژراوە. دیمانەیەك لەگەڵ فەخری شەمسەدین بەگی سیلاحشۆڕ لە ٢٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ ، هەولێر.

(٤٥) صدیق الدملوجي، إمارة بهدینان الكردیة، مطبعة الاتحاد، الموصل، ١٩٥٢،ص٩٩

.

دووەم[٤٦] ڕەواندز دەکاتە یەکێك لە بنکەکان بۆ لێدانی جوولاًنەوەکە بە هاوکاریو هەماهەنگی هەندێك لە هۆزەکانی ناوچەکە[٤٧]. بەلاًم دەبێ ئاماژەش بۆ ئەوە بکەین کاتێك شێخ عەبدولسەلام بارزانی ئاوارە بوو، پەیوەندی بە ڕووسەکانەوە کردو داوای هاوکاری لێکردن بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕینێك لە ڕەواندز، کەچی ڕووسەکان داواکارییەکەیان ڕەت کردەوەو ڕێگایان نەدا بچێتە ڕەواندز[٤٨].

هەلگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان لە هاوینی ١٩١٤ و هاتنە ناوەوەی دەولەتی عوسمانی لە تشرینی دووەمی هەمان سال لە تەك ولاًتانی ناوەڕاست[٤٩]. کوردستانی بە گشتی تێوەگلاند، ئەویش لە ڕێگای بەشداری کردنی کورد لە تەك سوپای عوسمانی لە ژێر

---

(٤٦) بۆ زیاتر لەسەر جولاًنەوەکەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٥٨، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپی یەکەم، چاپخانەی خەبات، دهوك، ١٩٩٨، ل١٧-٢١؛ د. عەبدوللاً عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەولەتی عوسمانیدا لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان( لێکۆلینەوەیەکە لە بورای مێژووی سیاسیدا)، سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٣٦-٢٤١.

(٤٧) پێ رەش، بارزان و حرکة الوعي القومي الکردیة١٨٢٦-١٩١٤، بدون مکان طبع، ١٩٨٠، ص ١٢٨؛ زبیر بلال إسماعیل، ثورات بارزان ١٩٠٧-١٩٣٥، الطبعة الاولی، مطبعة وزارة الثقافة، اربیل، ١٩٩٨، ص ص ٥٦-٥٧.

(٤٨) م. س . لازارێف، کێشەی کورد١٨٩٦-١٩١٧، بەشی یەکەم، وەرگێڕانی: د. کاوس قەفتان، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩، ل٣٧٩؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة دراسات ووثائق، طبعة الاولی، مطبعة وزارة التربیة، اربیل،٢٠٠٤،ص ٣٩.

(٤٩) محمد کمال الدسوقی، الدولة العثمانیة و المسالة الشرقیة، القاهرة، ١٩٧٦، ص ٣٧١.

کارتێکردنی پروپاگەندەی جیهادو، هەروەها بوونی ناوچە کوردییەکان بە مۆڵگەی شەڕو پێکدادانی لایەنە شەڕکەرەکان[٥٠]. ئەوەتە کاتێك سوپای عوسمانی لە بەرانبەر سوپای ڕووسی خۆی پێ‌نەگیرا سوپای ڕووس بە سەرکردایەتی جەنەراڵ جیورنوزویوڤو بە هەماهەنگی ئەرمەنەکان لە بەهاری ساڵی ١٩١٦ لە چوار قۆڵەوە دەستیان بە پێشڕەوی کرد: قۆڵی ڕایەت- گەلاڵە- دەرگەڵە-ڕەواندز. قۆڵی شنۆ- کێلەشین- سیدەکان-ڕەواندز. مەرگەوەڕ- شەمزینان-ئاکرێ-ڕەواندزو قۆڵی دیزادیر- وان- بەرواری بالاً- ئامێدی- ڕەواندز. هەر زوو هێزەکانی ڕووس لە بەرەبەیانی ٨ی مایسی ١٩١٦ دەستیان بە سەر ڕایەت گرتوو هێزەکانی عوسمانییان لێ وەدەرانا، لە بەر ئەوەی لە قۆڵی ڕایەت لە پێشڕەوی چاك دابوون توانیان دەست بە سەر گەلاڵەو دواتریش دەرگەڵە دابگرن. سوپای عوسمانی لە توانایدا نەبوو بەردەم ئەو لێشاوە بگرێت، بۆیە ڕووسەکان بەردەوام بوون تا لە ١٣ی مایسی ١٩١٦ گەیشتنە جوندیان[٥١] و لەڕۆژی دواتریش ڕەواندز[٥٢].

شیاوی باسە لازارێڤ بە پشت بەستن بە سەرچاوە ڕووسییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕووسەکان لە سەرەتای نیسانی ١٩١٦ دەستیان بەسەر ڕەواندز گرتووە[٥٣]. بەڵام سەرچاوەکانی دیکە کۆکن لە

---

(٥٠) د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٤، ص ١٣٠ و مابعدها.

(٥١) هاوینە هەواری جوندیان دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندز.

(٥٢) عەلی باوێل ئاغا، بیرەوەریەکانی عەلی باوێل ئاغا؛ مصطفى جندیانی، چۆن؟ ڕووسەکان ڕەواندزیان داگیر کرد... ! ١٣/٥/١٩١٦-١٨/٧/١٩١٦، گۆڤاری ڕواندز، ژمارە(١)، نیسانی١٩٩٨،ل ٢٥.

(٥٣) لازارێڤ ، سەرچاوەی پێشوو، بەشی دووەم، ل ٦١٤.

سەر ئەوەی کە لە ١٣ی مایسی ١٩١٦ سوپای ڕووسی دەستی بە سەر ڕەواندز داگرتووە[٥٤]. ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت، سەرەڕای نەبوونی ڕێگاو بانی چاكو بوونی ڕووباری قوڵو زنجیرە چیای بەرزو کەم پردی لە ناوچەکە سوپای ڕووس بە خێراییەکی زۆر توانی دەست بگرێت بە سەر ڕەواندز دا، کە ئەوەش لە سەرەتا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کوردەکان گوێیان بە داگیر کردنی ڕووسەکان نەداوە، بەڵکو لە هەندێ شوێندا چاوساغیشیان بۆ کردوونە[٥٥].

بوونی سوپای ڕووس لە ڕەواندز، جێگای مەترسیو دڵە ڕاوکێی سوپای عوسمانییەکان بوو، هەر بۆیە زوو سوپای عوسمانی کەوتەخۆ ئامادەکردن بە هاوکاری هێزە خێڵەکییە کوردەکانو لە ١٦ی تەمووزی ١٩١٦ لە چەند قۆڵێکەوە دەستیان بە هێرش کردو لە ١٨ی تەمووز ڕووسەکانیان لە ڕەواندزێ دەرپەڕاند[٥٦]. هەر چەندە بە ڕووالەت ڕووسەکان ماوەیەکی کورت لە ١٣ی مایس تا ١٨ی تەمووز واتە (٦٧) ڕۆژ لە ڕەواندزێ مانەوە، بەلاّم زوڵمو زۆرداریيەکی زۆریان

---

(٥٤) شكري محمود نديم، الجيش الروسي في الحرب العراق ١٩١٤-١٩١٧، بغداد، ١٩٦٧، ص ١٥؛ د. كمال مظهراحمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ٢١٩؛ دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، بەرگی یەکەم، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٢٢٥.

(٥٥) د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ١٧٠؛ کامەران ئەحمەد محەمەدئەمین، کوردستان لە نێوان ململانێی نێو دەوڵەتیی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١٠٢.

(٥٦) شكري محمود نديم، المصدر السابق، ص ؛ مەلا محەمەدی عەلیاوەیی، غەم ڕەوین، دەست نووس، ل١٠٠.

بەرانبەر بە خەڵكی ناوچەكە ئەنجامدا، ئەوەتە عەبدوڵلاّ پشدەری لە سەر زاری پیاوانی ڕەواندز دەگێڕێتەوەو دەڵێ:"**... من خۆم لە پیاوە كۆنەكانی ئەو ناوچەیەم بیستوە كە ئەیان ووت زۆر لە ژنانی ئەو شارە لـــــەترســـــی( فەساد) كردنیان خۆیان خستۆتە ناو گەلی (خەلەند)و مردون، چونكە دیتویانە كەوا سەربازەكانی ڕوس وەكو درندە جولانەوە لەگەڵ خەڵكی كوردستان دا**"[٥٧]. هەروەها سەرەڕای ئەوەی خانووەكانیشیان سووتاندن‌و ماڵەكانیان تالاّن كردن، ئەوەتە سەرچاوەكان ئاماژە بۆ مانەوەی چەند خانوێك دەكەن لە ڕەواندزێ ماوە كە ڕووسەكان كردوویانەتە بارەگای خۆیان[٥٨]. بەلاّم دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بكەین كە ئەرمەنەكانیش لە تەك سوپای ڕووسەكان ڕۆڵی خراپیان گێڕا لە هەتك كردن و كوشتن‌و برینی خەڵكی ناوچەكە ئەگەر بزانیین خۆیان لە سەر یەكێك لە كۆڵكەدارەكانی ڕەواندز ئەوەیان نووسیوە:" **ئێمەی لاوانی ئەرمەن لەگەڵ سوپای ڕووس هاتووین بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆمان لە كوردەكان بكەینەوە**"[٥٩].

---

(٥٧) عبدالله احمد رسوڵ پشدرەی، یادداشتەكانم، بەشی یەكەم، دار الحریة للطباعة، بغدا، ١٩٩٢، ل ٤٢.

(٥٨) د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ص ٢١٩؛ د. عزیز الحاج، القضیة الكردیة في العشرینات، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥، ص٩١؛ جرجیس فتح الله ، یقظة الكرد تاریخ سیاسي ١٩٠٠-١٩٢٥ ومما یتناول النزاع علی جنوب كردستان أمام عصبة الأمم مع الوثائق و المذكرات المتعلقة به، دار ئاراس للطباعة و النشر، اربیل، ٢٠٠٢، ص ٨٦.

(٥٩) ئەحمەد حەوێز ئەحمەد مەلا، بە سەركردنەوەی مامۆستا پێشەنگەكانی كوردستان، گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، ژمارە (٩)، تەمووزی ٢٠٠١، ل ٣٨.

ماوه بلێین لەگەڵ ئەوەی ڕووسەکان لە ڕەواندزێ دەرکران، کەچی بە داگیرکرنەوەی سوپای تورکیش هەر لە بارێکی خراپ دابوو و خەڵکی ناوچەکە تووشی ئاوارەیی‌و دەربەردەری بوون[٦٠]. بەلاّم بە کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان لە ساڵی ١٩١٨ و داگیرکردنی ڕەواندز لەلایەن ئینگلیزەکانەوە رەواندوز پێینایە قۆناغێکی نوێوە کە لە بەشی داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

---

(٦٠) حسێن حزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤؛ احمد خواجه، چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٦٨، ل ١٢.

## تەوەری یەکەم

# داگیرکردنی ڕەواندز لە لایەن ئینگلیزەکان و سەرهەڵدانی ڕاپەڕین لە دژیان

ئاگربەستی مۆدرۆس لە ٣٠ی تەشرینی یەکەمی ١٩١٨ کۆتایی بە جەنگی یەکەمی جیهان هێنا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی. بەڵام ئینگلیزەکان تا ئەو کاتەش دەسەڵاتیان نەگەیشتبووە هەندێ لە ناوچەکانی ویلایەتی مووسڵ کە خۆیان مەرامیان بوو[١].

پاش ئەوەی شاری سلێمانی کەوتە نێو بازنەی داگیرکاری ئینگلیزەوەو شێخ مەحموود بە حوکمداری دەست نیشان کرا[٢]، مێجەر نۆئێل[٣]( حاکمی سیاسیی ئینگلیز لە کوردستاندا)، بە مەبەستی

---

(١) ئیدمۆندس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر لە مەڕ ڕاگەیاندنی حوکمداریەتی شێخ مەحموود بڕوانە: ڕفیق حلمی، یادداشت کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ محمود، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٦، ل ٦٢.

(٣) مێجەر نۆئێل کە لە پێشتر کاپتن نۆئێل بوو: ئەفسەرێکی بریتانی چالاك و هێمن بوو و شارەزایی باشی لە زمانی فارسیدا هەبوو، هەروەها زانیاری باشی لە سەر هۆزەکانی ڕۆژهەلات هەبوو و چاکیش لە سەرکردەکانیان دەگەیشت. لە سەرەتا لە ناو بەختیارییەکان کاری دەکرد، کەچی دواتر لە ساڵانی کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی توانی پەیوەندی باش لەگەڵ سەرۆك هۆزە کوردەکان پەیدابکات و زمانی کوردی بە باشی فێر ببێت. هەرچەندە مێجەر نۆئێل ماوەیەکی کورت لە کوردستاندا مایەوە، بەڵام سەرنجی زۆر خەڵکی بەلای خۆیدا ڕاکێشا تا نازناوی

دانانی حاکمێکی سیاسیی ئینگلیز له لایەك و، له لایەکی دیکەشەوە، بۆ پەلکێشکردنی ناوچەکانی کۆیەو ڕانیەو ڕەواندز، بۆ نێو قەڵەمڕەوی حوکمداریەتی سلێمانی له کانوونی یەکەمی ١٩١٨، سەری لەو ناوچانەدا[٤]. له بەرانبەر ئەوەشدا دانیشتوانی ئەو هەرێمانە ڕەزامەندنیان نیشاندا بۆ دەسەڵاتداریەتی شێخ مەحموود بەسەریاندا، هەر بۆیە کاتێك شێخ مەحموود یاداشتێك بۆ کۆنگرەی ئاشتی له پاریس ڕەوانە دەکات شێخ عەبدولسەمەد زادە عەبدوڵلا که له شێخانی سەرانە بە ناوی خەڵکی ڕەواندزەوە دەنگی خەڵکی ناوچەکە دەخاتە پاڵ دەنگ و داواکاری شێخ مەحموود[٥].

مێجەر نۆئێل له ماوەی مانەوەی له ڕەواندز دەستی کرد بە ڕێکخستنی کاروباری ناوچەکەو ڕاکێشانی سەرۆك هۆزەکان، له ڕێگای بڕینەوەی مووچەی مانگانەو دانی قەرزی کشت وکاڵی پێیان، تا بتوانن باری لەنگی خۆیانی پێ ڕاست بکەنەوەو، خەڵکی ڕەواندزیش لەو بارە نا ئارامی و نا ئاساییە ڕزگار بکەن، کە

---

(لۆرانسی کوردی)یان پێبەخشی. د. کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ص ١٨٦-١٨٧.

(٤) السر أرنولد ويلسن، الثورة العراقية، ترجمة: جعفر الخياط، مطبعة دار الكتب، بيروت، لبنان، ١٩٧١، ص ١٨٤؛ لوسيان رامبو، الكرد و الحق، ترجمة: عزيز عبدالاحد عوديش، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص ٧٥" جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص ص٢٠٩-٢١٠.

(٥) کەمال نووری مەعرووف، یادداشتەکانی شێخ( لەتیف)ی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی حەفید، چاپی یەکەم، لە بڵاوکردنەوەی مەکتەبی ناوەندی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٥، ل ل ٤٠-٤٢.

دەرئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهان بە گشتیو هێرشی ڕووسەکان بە تایبەتی ناچاری کرد بوون گژوگیاو گۆشتی پشیلەو سەگو بگرە مرۆڤیش بخۆن[٦].

حوسێن حوزنی موکریانی ئاماژە بە هاتنی مێجەر نۆئێلْ دەکات بۆ ڕەواندزو دەڵێ: " **کانونی یەکەم سالی هەزارو نۆ سەدو هەژدەی میلادی میجر نویل بۆ ادارکردنی قضای رەواندز کرا بە معاونی حاکمی سیاسی، لە دوای داگیرکردنی انکلیز ئەو پیاوە یکەمین حاکمیکی انکلیزە کە لە سەر قضای رەواندز داندراوە**"[٧].

لێرەشدا دەتوانرێ بووترێ، حوزنی بە هەڵەدا چووە، ئەگەر بزانیین مێجەر نوئێلْ خۆی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی لە ڕەواندز دامەزراندوە[٨]. هەروەها جگە لەوە هەر ئەوە بە تەنیا ئاماژە بۆ سێ حاکمیتر دەکات کە دوای نۆئێلْ هاتوونەتە ڕەواندزێ بە پلەی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی( ASSISTANT POLITICAL OFFICER)وە[٩].

شیاوی باسە دوای ئەوەی کاپتن بێلْ بە سیفەتی یاریدەدەری حاکمی سیاسیی لە ڕەواندز دامەزرا، هێندەی پێ نەچوو شۆڕشی شێخ

---

(٦) المس بيل، فصول من تاريخ العراق القريب كتاب يبحث عن العراق في عهد الاحتلال البريطاني بين سنتي ١٩١٤و ١٩٢٠، ترجمة: جعفر الخياط، ١٩٧١، ص ١٩٢.

(٧) حسين حزنی موكريانی، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١١٤.

(٨) سير أرنولد ويلسن، المصدر السابق، ص ١٨٤.

(٩) حسين حزنی موكريانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.

مەحموود لە سلێمانی هەڵگیرسا[10]، دایسانی شۆڕش لە سلێمانی، کاریگەری کردە سەر ناوچەکانی ڕەواندزو دەوروبەری. ئەوەتە ڕەفیق حلمی وەکو شایەتحاڵێك لە ڕەوشی ئەو سەردەمەی ڕەواندز دەڵێ:" کە **دەنگی شۆڕشی(( شێخ مەحمود)) لە ڕەواندزو لە ناو عەشایرا بڵاو بوەوە، گەلێ کەس پێی خۆش بوو، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە ئینگلیزەکان ناڕەزا بوون‌و لە کردەوەی دەس‌و پێوەندەکانیان وەڕز بوو بوون، ئیتر هەر چیت ئەبینی چەکی لە خۆی ئەداو لە ڕودا خۆی بۆ شەڕ ئامادەکرد، خۆ دێهاتی‌و عەشایرەکە باسی هەر ناکرێت ئەوەی دوو پیاوی هەبوو ئەیکرد بە چوار چەکی پێ‌هەڵ ئەگرتن‌و شانازی پێوە ئەکردن زۆر لە مانە ئۆقرەیان لێ هەڵ گیرا بوو بە تەمابوون شۆڕشەکەی(( شێخ مەحمود)) پەرەبسێنێت، بتەنێتەوە، بگاتە ئەم دیوی (( زێ)) [ مەبەستی ئەودیوی زێ کۆیەیە- توێژەر]. چاوەڕێ بوون کە لەشکری شێخ مەحمود نزیك بکەوێتەوەو بەری ((کۆیە)) بگرێتەوە تاوەکو ئەمانیش لە عاستی خۆیانەوە ڕاست بنەوە، دەس بدەنە چەك‌و شۆڕشی بگێڕن ..."**[11]. لێرەدا بۆ مان دەردەکەوێت کە شۆڕشەکەی شێخ مەحموود کاریگەری زۆری کردۆتە سەر خەڵکی ناوچەی ڕەواندزو تەنانەت بۆی کەوتوونەتە پروپاگەندە کردنیش. هەر بۆیە ڕەفیق حلمی بەدەم گێڕانەوەی ڕەوشەکە بەردەوام دەبێت‌و

---

(١٠) بڕوانە: م. ر. هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی یەکەم، لەندەن، ١٩٩١، ل٤٩٤و بەدواوە ؛ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی/ سیاسی‌یە، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١١٥.

(١١) رفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٩.

دەڵێ:"... هەر لەبەر ئەم مەبەسەش زۆریان لە مانە باسی سەیر سەیریان هەڵ ئەبەستو بڵاویان ئەکردەوە شتی ئەو تۆیان ڕێك ئەخست کە ئینسان سەری تیا سوور ئەما. هەرچی کارەساتو ڕووداوی ڕاستو درۆ هەیە وە یا بیسراوە ئەوەندەی تریشیان لە خۆیانەوە ئەنایە سەرو ئەیانگێڕایەوە ..." (١٢). بۆیە دەتوانرێ بووترێ، ئەو هەموو کاریگەرو هەڵوێستە جگە لە هاندەری نیشتمانی هاندەری مادیشی بە بەرەوە بوو، لە بەر ئەوەی لەو کاتەدا کۆگاکانی حکومەت لە ڕەواندز زەخیرەییەکی زۆری تیایدا بووو، تالآن کردنی لە لایەن هێزە عەشائیرییەکان لە ڕۆژێکی وادا شتێکی کەم نەبوو.

دەرئەنجامی گردبوونەوەی ژمارەیەکی بەر چاو لە سەرۆك هۆزەکانی دەرووبەری ڕەواندز بە خۆیانو چەند چەکدارێکەوە، مەترسی بۆ یاریدەدەری حاکمی سیاسیی ئینگلیزو هاریکارەکەی دروست کرد بوو، چونکێ لەو ڕۆژانەدا کاپتن بێلّ هەر بە تەنیا لەگەڵ هاوکارەکەی لە ڕەواندز بوو، هاوکارەکەشی مەشقی سەربازی بەو هێزە چەکدارە بەکرێ گیراوە دەکرد کە لە ژێر سەرکردایەتی نووری باویل ئاغا(١٣) دابوونو

(١٢) رفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

(١٣) نووری باویل ئاغا کوڕی باویل ئاغا کوڕی مەلا عەزیزە و ساڵی ١٨٩٢ لە ڕەواندز لە دایك بووە، بە منداڵی لە حوجرە خوێندویەتی و دواتریش لە قوتابخانەی ڕوشدیە لە ڕەواندز. دوای ئەوەی کە ئینگلیزەکان ڕەواندزیان داگیر کرد کردیانە بەڕێوەبەری پۆلیسی ڕەواندز، بەڵام زۆری پێ ناچێت نێوانی لەگەڵ حاکمی ئینگلیزەکان تێك دەچێتو بەرویاندا هەڵدەگەڕێتەوە( کە دواتر باسی لێوە دەکەین) . نووری ئاغا بەشداری شۆڕشی( ١٩٤٣-١٩٤٥) بارزانی کردووە لەگەڵ شۆڕشی ئەیلول تا لە ساڵی ١٩٦٣ بە هۆی نەخۆشییەوە کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی گەردە گەرد لە ڕەواندز نێژراوە. عەلی باویل ئاغا، بیرەوەریەکانی عەلی باویل ئاغا.

ژمارەیان نزیکەی ١٥٠ - ٢٠٠چەکدارێك دەبوو[١٤]. بۆیە کاپتن بێلّ کەوتەخۆ و دەستی کرد بە بەخشینی پارە بە سەر ئەو سەرۆك هۆزانە. سەبارەت بەو ڕەوشە شایەدحالّێك دەلّێ:"... لە سەر دەسی( خۆم)دا ئەم لێشاوە ڕوپیەیەی بە سەر ئەوانەدا بلاّوکردەوە کە لە(ڕەواندز) چاوەڕوانی تالاّن بوون[مەبەستی سەرۆك هۆزەکانە – تویژەر]، بەمە تالاّنی لە بیر بردنەوەو چاو بەرەو ژێری کردن"[١٥].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە کاپتن بێلّ دوای دەست بە تالّ بوونی لە سەرۆك هۆزەکان بایدایەوە بە لای گەورە پیاوانی ڕەواندزو کۆبوونەوەیەکی لەگەلّ ساز کردن، بۆ ئەوەی لە بیروڕای ئەوانیش بگات سەبارەت بە شێخ مەحموودو شۆڕشەکەی، ڕەفیق حملی کە یەکێك بووە لە بەشدار بووانی کۆبوونەوەکە دەلّێ:" بیل پیاوە ناسراوەکانی (ڕەواندز)ی لە مالّی خۆیا کۆکردەوەو ویستی لە لایەن بیروباوەڕیانەوە بەرامبەر بە((شێخ مەحمود))و شۆڕشەکەی گفتوگۆیان لەگەلّ بکا مەبەسی ئەوە بوو بزانێت کە ئەگەر هاتوو دەستەیەك لە هێزەکانی شێخ مەحمود لە زێی کۆیە بپەڕێتەوەو یا بێتو((شێخ مەحمود)) جواب بۆ عەشایری دیوی کۆیەو ڕەواندز بنێرێتو داوای یارمەتی یا تێکەلّ بوون بە شۆڕشەکەیان لێ بکا بە قسەی ئەکەنو شوێنی ئەکەون یان نە؟. جگە لەمەش لێی پرسین کە ئاخۆ بە لای ئەوانەوە ئەم کارەی شێخ مەحمود یاخی بوونی لە ئینگلیز کارێکی ڕاستو

---

(١٤) أي، ام، هاملتون، طريق في كردستان، ترجمة: جرجيس فتح الله، الطبعة الثانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية ، اربيل، ١٩٩٩، ص ٢٢٠.

(١٥) رفيق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٠.

ئۆزدمیرا[١٠٦]، له لایه‌کی‌تریش سه‌ید ته‌ها بیّ هاوکاری سمکۆ که‌وته ڕێکه‌وتن له‌گه‌ڵ ئینگلیزه‌کان‌و به هێزێکی ١٥٠ که‌سی له ناوه‌ڕاستی ته‌شرینی دووه‌می ١٩٢٢ هێرشی کرده سه‌ر ناوچه‌کانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئۆزده‌میر، ئه‌گه‌رچی سه‌ید ته‌ها له شه‌ڕه‌کاندا سه‌رکه‌وتنی ته‌واوی به ده‌ست نه‌هێنا به هۆی باران بارینێکی زۆر له ناوچه‌که‌دا، به‌ڵام توانرا ده‌ست بگرنه‌وه به سه‌ر ناوچه‌کانی ڕانیه‌و ده‌ورووبه‌ری‌دا له ژێر کاریگه‌ری هێزی ئاسمانی ئینگلیزه‌کاندا[١٠٧]. لێره‌شدا ده‌بیّ ئاماژه بۆ ئه‌وه بکه‌ین که ئه‌و هێرشانه هاوکات بوو له‌گه‌ڵ دانیشتنی نوماینده‌ی ئینگلیزه‌کان‌و که‌مالییه‌کان له لۆزان، هه‌ر بۆیه وه‌زاره‌تی کۆلۆنیای بریتانی فه‌رمانی‌دا به کۆمیسیاری باڵا که ئیتر هێرش نه‌کرێته سه‌ر سه‌نگه‌ره‌کانی تورك هه‌تا له ناو خاکی عیراقیش دابێت، به‌ڵام کۆمیسیاری باڵا ده‌ڵێت: خۆش به‌ختانه ئه‌و فه‌رمانه دره‌نگ گه‌یشت[١٠٨].

به هاتنی سمکۆ تورکه‌کان به گشتی‌و ئۆزده‌میر به تایبه‌تی ترسی ئه‌وه‌یان لیّ نیشت، نه‌کا بداته ته‌ك ئینگلیزه‌کان‌و هاوکارییان بکات. له به‌ر ئه‌وه‌ی به‌سری به‌گی قوماندانی جه‌بهه نامه‌یه‌ك ئاراسته‌ی ئۆزده‌میر ده‌کات‌و ده‌ڵیّ:" **سمکۆ کابرایه‌کی فێڵبازه به هۆی زرنگی**

---

(١٠٦) ئیدمۆندس، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ٣٧٥؛ کریس کۆچێرا، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٨٠.

(٦) ئیدمۆندس، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٣٧٢؛ کریس کۆچێرا، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٨٠؛ لونگریك، المصدر السابق، ص ٢٩٣.

(١) دیڤید ماکداول ، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، به‌رگی یه‌که‌م، ل ٢٩٨.

**خۆیەوە ئەو خەنجەرە کە هەڵیگرتووە بۆ کاتی خۆی ئەشارێتەوە... دەرکەوتنی سمکۆو لە ناو عەشایری کوردا بەم جۆرە گەورە بوونیو دەسەلآت پەیا کردنی بۆ (حکومەتیمیللی) ئێمە( واتا بۆ حکومەتی تورك) دەس نادا..."[109]. هەروەها کاتێکیش سمکۆ بەرەو سلێمانی** بۆ لای شێخ مەحموود دەکەوێتە ڕێ، ئۆزدەمیر دەکەوێتە ئەندێشەیەکی گەورەوە، بۆیە لە لایەك فەوزی بەگ، ڕەمزی بەگو ئەحمەد تەقی ڕەوانەی سلێمانی دەکات[110]و، لە لایەکیتریش لەگەڵ کۆمەڵەی (کرکوك مدافعه حقوق جمعیتی)[111]دا دەکەوێتە نامە گۆڕینەوەو دەڵێ:" **ئەو نامانەی کە( سمکۆ) بۆ سەرەك عەشیرەتەکانی کوردی نارد بوو، لە ڕێگە کەوتە دەس ئێمە. بە ڕاستی ( خیانەتو جنایەت) هەر ئەمەندە ئەبێ( سمکۆ ) لەم نامانەدا ئەڵێ: بەو هێزانەوە کە لە هەولێرو سلێمانی پێکیەوە ئەنیم پەلاماری تورکەکانی( ڕەواندز) ئەدەم. ئێوەش بە خۆتانو عەشایرتانەوە بە رووالەت بۆ کۆمەکی تورکەکانیو یارمەتی دانی ئەوانن بچنە لای ئۆزدمیر بۆ ڕەواندز و بیگرن. دوای ئێوە منیش بە هێزەکەی خۆمەوە هەڵ ئەکوتمە سەر(ڕەواندز)و هەر زابتو عەسکەرێکی کە لە وێ بێ ئەیانکوژینو شارەکە لە تورك پاك ئەکەینەوە ..."[112]**. لێرەدا بە دیاردەکەوێت کە

(١٠٩) رفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٥٨٣.

(١١٠) احمد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٦.

(١١١) ئەو کۆمەڵەیە لە کەرکوك لە لایەن ئەو کەسانەوە دامەزرابوو کە خۆیان بە تورك دەزانی. رفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٨.

(١١٢) رفیق حلمی، هەمان سەرچاوە، ل ٦١٣.

سمكۆ بۆ مەبەستی ئەوە چۆتە سلێمانی تا هاوکاریو هەماهەنگی لە شێخ مەحموود وەربگرێتو لە هێزەکەی ئۆزدەمیر بدات هەر بۆیە لە نامەکەی دا بەردەوام دەبێتو دەڵێ:"... من لەو باوەڕەدام کە تا سمکۆ لە سلێمانی بێ هەرچی ئەکریو یا بمانەوێ بیکەین، لە وانەیە سەر نەگرێو یا بە پێچەوانەی مەبەسی ئێمە، بێتە دی..."[113]. لێرەدا ڕای خۆمان دەخەینە تەك ئەو لێکۆڵەرەوەیەی کە دەڵێ:" دوور نیيە ئینگلیزەکان هەر خۆیان ئەو نامانەیان بە ناوی سمکۆوە نوسیبێو وێنەیەکیشیان بۆ ئۆزدەمیر ڕەوانە کردبێ تا نێوانی بە تەواوەتی لەگەڵ تورکەکان تێك بچێتو لە کاتی چوونیشی بۆ سلێمانی سمکۆو شێخ مەحمود لە تورکەکان دوور بخەنەوە"[114]. چونکێ ئینگلیزەکان لەو بارەیەوە دەستێکی بالآیان هەبووە.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سمکۆ لە دوای گەیشتنی بۆ سلێمانی بە پێچەوانەی ویستی ئینگلیزەکانو لە ژێر کاریگەری تورکخواکان دەکەوێتە ڕێکەوتنو لە ڕێگای سنووری دەسەلاَتی ئۆزدەمیرەوە دەگەڕێتەوە ناوچەکانی سەر سنوور[115]. بەلاَم دەتوانرێ بووترێ، کە سمکۆ لە ژێر گوشاری جگەر گۆشەکەی (خەسرەو) کە دیل بوو لای تورکەکان، لە لایەكو، دەست کەوتنەوەی خەزێنە دەست

---

(١١٣) رفیق حلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١٥.

(١١٤) محمد رسول هاوار، سمکۆ... ، ل ٥٩١.

(١١٥) عبدالرقیب یوسف و سدیق سالح، بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٩٨.

به سەر گیراوەکەی لە لایەکی‌تردا، کەوتە ژێر کاریگەری تورکخواکان‌و لەگەڵ تورکان کەوتە ڕێکەوتن.

سەر ئەنجامی گفت‌وگۆی نێوان نوێنەری ئۆزدەمیرو شێخ مەحموود لە سلێمانی هەر دوولا دێنە ڕێکەوتن لە سەر ڕەوانە کردنی وەفدێك بۆ ڕەواندزو لە وێشەوە بۆ ئەنقەرە، هەر بۆیە شێخ مەحموودی حەفید، فایەق تاپۆ، فەتاحی ژن برای، ئەحمەد تەقی‌و ڕەفیق حلمی ڕەوانە کرد[١١٦]. بەڵام لە کاتی چوونی نوماینەدەی شێخ مەحموود بۆ ڕەواندز ڕەوشی ناوخۆی ئەوێ گرژی تێکەوتبوو بە هۆی ململانێی نێوان حاجی نەورۆز ئەفەندی، محەمەدعەلی ئاغای جوندیانی‌و شێخ محەمەد ئاغای وەلاش لە لایەك‌و نووری باویل ئاغاو شێخ ڕەقیب لە لایەکی‌تردا کە ئۆزدەمیر ڕۆڵی کاریگەری تیادا دەگێڕا[١١٧].

ئیتر بە بیستنی ڕێکەوتنی شێخ مەحموودو تورکەکان‌و بێ‌هیواییان لە هاوکاری کردنیان، ئینگلیزەکان لە دوو قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر ڕەواندز، قۆڵی کۆیە بە سەرکردایەتی سەرهەنگ ڤنست کە مەبەستی دابڕان‌و دوورخستنەوەی شێخ مەحموود بوو لە تورکەکان، لەگەڵ قۆڵی سنوور بە سەرکردایەتی سەرهەنگ دوبس، بە هاوکاری لەگەڵ هێزی ئاسمانی چوونە پێشەوەو، ئۆزدەمیر بە بێ بەرگری لە ڕێگای سنووری ئێرانەوە هەلات‌و لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ ئینگلیزەکان ڕەواندزییان

---

(١١٦) جەلال تەقی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٧٠؛ ڕەمزی قەزاز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٣.

(١١٧) ڕەمزی قەزاز، هەمان سەرچاوە، ل ل ١٥٣-١٥٤.

داگیرکردەوە[١١٨]. ئەنجام ئینگلیزەکان بە هاوکاری لەگەڵ حکومەتی عیراق کە بە پرس و ڕای ئەوان بەڕێوە دەچوو کەوتنە بەڕێوەبردنی ئەوناوچانەوە[١١٩]. بەمەش ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز پێی نایە قۆناغێکی نوێوە کە لە بەشی داهاتوودا باسی لێوەدەکەین.

(١١٨) د. محمد مظفر الادهمي، المصدر السابق، الجزء الثاني،ص ٤١؛ حەسەن ئەرفەع، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٨؛ عەلی سەیدۆ گەورانی، لە "عەممان"ەوە بۆ" ئامێدی" گەشتێك بە کوردستانی باشووردا، وەرگێڕانی: تالیب بەرزنجی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ،٢٠٠٠، ل ٢٠٢؛ حوسێنی مەدەنی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٣٥٨-٣٥٩.

(١١٩) ئەحمەد باوەڕ، ئۆزدەمیر و کورد، ل ٣٥.

# بەشی دووەم

## ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە ساڵانی ئینتیدابی بریتانی و قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقدا (١٩٢٣-١٩٣٩)

## تەوەری یەکەم

# دامەزراندنەوەی دەسەلآتی ناوەندی لە ڕەواندز
# (١٩٢٣-١٩٣٢)

کۆنگرەی سان ڕیمۆ [١] لە ٢٥ی نیسانی١٩٢٠ عیراقی خستە ژێر ئینتیدابی بریتانیاوە، بەلاّم بە هۆی سەرهەلّدانی ڕاپەڕین لە ڕەواندزو نەمانی دەسەلاّتی ئینگلیزو هاتنی سوپای تورك کە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ڕەواندزی لەو ڕژێمە دابڕیوە تا داگیر کردنەوە لە لایەن هێزەکانی بریتانی لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ وە.

دەست گرتنەوە بە سەر ڕەواندز لە لایەن هێزەکانی بریتانیا لە ڕۆژێك بەر لە دانیشتنی دووەمین کۆنگرەی لۆزاندا، مشتومڕو گلەییو گازاندەی زۆری خستە نێوان نوێنەری بریتانیو تورکی لە کۆنگرەکەدا، چونکە تورکەکان داگیر کردنەوەی ڕەواندزیان بە مایەی بێزاریی کوردو تورك لە قەلّەم دەداو بە دەرچوون لە ئاگر بەستی مۆدرۆسیان دەزانی [٢]، لە بەرانبەریشدا ئینگلیزەکان داگیرکردنەوەکەیان بە مافێکی ڕەوا لێکدەدایەوەو دژی هاتنەوەی دەسەلآتی تورکی بوون بۆ ئەوێ [٣]. هەر بۆیە بێ گوێدانە ئەو گلەییو گازاندانە دەسەلآتدارانی

---

(١) کۆنگرەی سان ڕیمۆ ناوەکەی بۆ شاری سان ڕیمۆی ئیتالی دەگەڕێتەوە.

(2)FOREGN OFFICE 371/9005,E4474, From Sir.H.Rumbold (Lausanne),4May1923,P86 .

(3)FOREGN OFFICE, 371/9005, Lord Curzon to Sir H.Rumbold (Lausanne), 5 May1923, P162.

بریتانی له عیراق به هاوکاری لەگەڵ حکومەتدا کەوتنە خۆ بۆ دامەزراندنەوەی دەسەڵاتی ناوەندیی له ڕەواندز دا، بۆ ئەو مەبەستەش له ۲۹ی نیسانی ۱۹۲۳ نوێنەری کۆمیسیاری باڵا لەگەڵ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عیراقی سەردانی ڕەواندزیان کردو لەگەڵ ناودارانو سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکەدا کۆبوونەوەو بڕیاری ئەوەیان دا که ڕەواندز له ڕووی کارگێڕییەوە به لیوای هەولێر ببەسترێتەوەو قائیمقامی تیادا دابمەزرێ[٤].

ڕەواندز لای بریتانییەکان گرنگیو بایەخی خۆی هەبوو به هۆی شوێنە جیۆگرافییەکەی که کۆنترۆڵی ڕێگای سنووری باکووری ڕۆژهەڵاتی دەکرد، چونکیٚ کۆنترۆڵ کردنی دەبووە بەر بەستێك له بەردەم جموجۆڵو پروپاگەندەی تورکەکان[٥]. ئەگەر بزانیین تا ئەو کاتەش تورکەکان پروپاگەندەیان بۆ ئەوە دەکرد که دەسەڵاتیان بۆ ولایەتی مووسڵ دەگەڕێتەوە. هەر بۆیە دەبوو ئینگلیزەکان له ناوچەکەدا دەسەڵاتێك دابمەزرێننو کەسێکیش تیایدا بکەن به فەرمانڕەوا له خۆیان نزیك بێتو جێگای متمانەی ئەوان بێت، لێرەشدا سەید تەهای نەهری چاکترینو شیاوترین کەس بوو بۆ فەرمانڕەوایی ناوچەکە له بەر ئەوەی له لایەك دەسەڵاتێکی فراوانی له ناوچەکەدا هەبووو جێگای ڕێزی خەڵکی دەڤەرەکە بوو، له لایەکیتریش دوژمنی سەر سەختی کەمالییەکان بوو. ئیتر ئەوە وای کرد که ئینگلیزەکان دوای پرس کردن به سەرۆك وەزیرانی حکومەتی

---

(٤) د.محمد مظفر الادهمي، المصدر السابق، ص ٥٢.

(٥) أ . م. مينتشاشيفيلي، المصدر السابق، ص ص ٣٢٦-٣٢٧.

عیراق، سەید تەهای نەهری لە ٤ی مایسی ١٩٢٣ بە قائیمقام لە سەر ڕەواندز دابمەزرێنن(٦).

بریتانییەکان بە مەبەستی پاراستنی ڕەوشی ئاسایشی ڕەواندز جگە لە هێزی سەید تەهاو سەردارانی ناوچەکە هێزێکی سەربازی ئاشوورییەکانیان لە دەڤەرەکەدا جێ هێشت بۆ ئەوەی هاوکاریو هەماهەنگی سەید تەها بکەن لە ڕێکخستنو دابین کردنی ئاسایش تیایدا(٧)، ئەوە لە لایەك، لە لایەکیتریش لەگەڵ حکومەتی عیراقیدا کەوتنە ڕاوێژ کردن تا دەسەلاتی سەید تەها جێگیر تر بکەن. چونکێ لە نامەیەکیدا پشکنەری کارگێڕی بریتانی لە ٩ی مایسی ١٩٢٣ کە بە زمانی عەرەبی بۆ سەید تەهای ڕەوانە کردووە دەڵێ:" **بە پێی ئەو ڕاگەیاندنەی کە لە وەزارەتی ناوخۆوە لە بەغدا پێمان ڕاگەیەندراوە ئێوە کراون بە قائیمقامی شارۆچکەی ڕەواندز کە سەر بە لیوای هەولێرە. بۆ ئەوە پێویستە کاربەدەستانی دادگاو داراییو کارگێڕیو پۆلیس دامەزرێنن بە پێی ئەو بودجەی کە ڕەزامەندیی لە سەر کراوە،**

---

(٦) د. ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣ ؛ د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٨٢.

(٧)FORIGN OFFICE 371/9005,Telegram From the Acting High Commissioner for Iraq to the secretary of State for the Colonies,11may 1923,P.66;

قسطنطين بيتروفيج ماتفيف بارمتى، الاشوريون و المسالة الاشورية في العصر الحديث، الطبعة الاولى، دمشق، ١٩٦٨، ص ١٣٠؛ کرێکار عبدالله حسین، کورد و ئاشوری، چاپی یەکەم، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ، ئۆفسێتی داناز، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ١٣٨.

وە دەسەڵاتی ئەوەتان پێدراوە کە تا شەش هەزار ڕوپیە لە مانگێکدا خەرج بکەن بۆ مەبەستی دامەزراندنی دەزگاکانی حکومەتی عیراقی بڕیاردرا کە سێ هەزار ڕوپیەتان بۆ تەرخان بکرێت، دەربارەی دەسەڵاتی دادگایتان لە ژێر گفتوگۆ دایە هیواداریین بەو زووانە لە مەش ئاگادارتان بکەین لەگەڵ هەندێ زانیاری تر کە پەیوەندیی بەوەزیفەکەتانەوە هەیە"[٨].

لە لایەکی دیکەدا مانەوەی کێشەی مووسڵ بە هەڵواسراوی لە دوای بەستنی پەیماننامەی لۆزان لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ و چارەسەر نەکردنی لە کۆنگرەی قوستەنتینیە لە مایسی- حوزەیرانی٩٢٤[٩]، کێشەکەی خستە بەردەم کۆمەڵەی گەلان لە ٦ی ئابی ١٩٢٤ دا، هەر بۆیە کۆمەڵەی گەلانیش بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەکی‌دا لە ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٤ تا ڕەوانەی ناوچەکەی بکا، سەرئەنجام لیژنەکە لە١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ گەیشتە بەغداو دواتریش سەری لە مووسڵو شارو شارۆچکەکانی‌تردا. فازڵ حوسێن لە بارەی ڕەواندزەوە دەڵێ:" لە

(٨) بڕوانە پاشکۆی ژمارە ( ٣ ) .
(٩) کۆنگرەی قوستەنتینییە لە ١٩ی مایسی ١٩٢٤ لە باڵەخانەی کۆنی عوسمانی بە ناوی قاسم پاشا لە ئەستەنبوڵ لە نێوان نوماینەدەی بریتانی بە سەرۆکایەتی سیر برسی کۆکس کۆمیسیاری باڵای بریتانی لە عێراق و نوماینەدەی تورکی بە سەرۆکایەتی فەتحی پاشا سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی گەورە بەسترا بۆ مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی ویلایەتی مووسڵ. ئەگەرچی کۆنگرەکە بەردەوام بوو لە کارەکانی تا ٢٤ ی تەمووزی ١٩٢٤ بەڵام چارەسەری کێشەکەی پێنەکرا و خستیە بەردەم کۆمەڵەی گەلان. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ناوەرۆکی کۆنگرە کە بڕوانە: بیار مصطفی سیف الدین، السیاسة البریطانیة تجاه ترکیا واثرها في کوردستان ١٩٢٣-١٩٢٦، الطبعة الاولی، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٤، ص ١٦١ وما بعدها.

**مەرکەزی ڕەواندز کە دانیشتوانێکی دواکەوتووی تێدا بوو زۆربەی ئەوانەی پرسیاریان لێکرا مەیلیان بە لای عیراق دابوو"**[10]. هەروەها **ڕۆژنامەی(ئەل ئیستقلال)یش لە دوو ژمارەی خۆیدا بیروڕای خەڵکی ڕەواندز بلاّودەکاتەوە کە وتویانە:" مووسڵ بەشێکە لە عیراق و جیاناکرێـــتەوە وە ناشێ عیراق بە بێ ئەو بژی" و " ئێمە فەیسەڵـــی یەکەمان هەڵبژارد کە لە نەوەی پێغەمبەرمانە، وە خۆمان بە عیراق بەستایەوە کە بەشێوەیەکی وا هێزێك نەبێت لێکمان بکاتەوە، ئەگەر تورك ویستی دەست بگرێت بە سەر شارۆچکەکەمان ئێمە ئامادەیین کە پارێزگاری بکەین هەتا دوا توانامان ..."**[11].ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە مەعروف چیاووکـــ[12] وەکو کەسایەتییەکی

---

(١٠) د. فاضل حسین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٢.

(١١)جريدة الاستقلال( الموصـل)، العـددان( ٩/٢/ ١٩٢٥ ،٢٧/٢/١٩٢٥). لـە: د. عبدالامير هادي العكام، الحركة الوطنية في العراق١٩٢١-١٩٣٣، مطبعـة الاداب، النجف الاشرف، ١٩٧٥، ص ص ١٩٧-١٩٨. وەرگیراوە .

(١٢) مەعروف چیاووکـــ ، ناوی تەواوی مەعروف کوڕی عەلی ئەسغەر ئەفەندی کوڕی حاجی مەولوود ئەفەندی یە، دایکی ئامینە خان لە بنەماڵەی بابانەکانە، بە ئەسڵ خەڵکی دێی سرێشمەی سەر بە ناوچەی ڕەواندزە و لە دایك بووی ســاڵی ١٨٨٥ ە ، خوێندنی سەرەتایی و ڕوشدیەی لە بەغدا تەواو کردووە دواتر بۆ مەبەستی خوێندن ڕووی کردۆتە ئەستەنبۆل و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە کۆلیژی مــاف بـە دەست هێنــاوە. لەگــەڵ ڕاگەیانــدنی دەســتوری عوسمــانی١٩٠٨ دەچــێتە ڕیــزی حزبــی ئازادیخوازی عوسمانی و گەلێك گوتار لە ڕۆژنامەکانی ئــەو کاتــە دەنووســێ، دوای گەڕانەوەشی بۆ بەغدا لە ١٩١٢ ڕۆژنامەیەك بە ناوی( ئـەلحقوق) لـە بەغــدا بــە زمـانی عەرەبی دەردەکات. ئینجا لەگەڵ سەرهەڵدانی جـەنگی یەکـەمی جیهــانی بەشدار دەبێت و سەرئەنجام دیل دەکرێت و ڕەوانەی ولاّتی بۆرما دەکرێت. لـە پــاش جەنگیش کە دەگەڕێتەوە ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕێت و دەبێتە ئەندامی ئەنجومــەنی

ناوچەکە دەنگی خۆی خستۆتە پاڵ دەنگی ئەوانەی کە مووسڵ یان بە بەشێکی جیانەکراوە لە عیراق داناوە[١٣].

کاتێکیش لیژنەکە گەڕایەوە بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی کۆتایی و دوا بڕیاری کۆمەڵەی گەلان، حکومەتی عیراقی لە ٢٠ی ئابی١٩٢٥ بۆ مەبەستی بە دواداچوونی چارەسەرکردنی کێشەکە بڕیاریدا کەوا وەفدێك ڕەوانەی کۆمەڵەی گەلان بکا بە سەرۆکایەتی ناجی سویدی (١٨٨٢-١٩٤٢) وەزیری دادو ئەندامیەتی هەریەك لە جەعفەر عەسکەری( ١٨٨٥-١٩٣٦) نوێنەری سیاسیی عیراق لە لەندەن و بەتریك یوسف عەمانۆئیل ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەرشەد عومەری نوێنەری مووسڵ و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی نوێنەری هەولێر، بەڵام نە ئەنجومەنی نوێنەران و نە باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بریتانی لە عیراق بەو بڕیارەی حکومەت ڕازی نەبوون. چونکێ باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بریتانی لە نامەیەکیدا کە ئاراستەی

---

نوێنەران و دواتریش ژمارەیەك پلەو پایەی کارگێڕی وەردەگرێت تا خانەنشین دەکرێت. چیاووك لە ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات و لە سەر وەسیەتی خۆی لاشەکەی دەهێننەوە هەولێرو بە خاکی دەسپێرن. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ئەو کەڵە پیاوە بڕوانە: د. ئیسماعیل شوکر ڕەسول، مەعروف چیاووك ١٨٨٥-١٩٥٨ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویيە، گۆڤاری زانکۆ، ژمارە (٢٢) ، ئابی ٢٠٠٤، ل ل٥ — ٢٦؛ کەریم شارەزا، لە کەسایەتییە ناودارەکانی هەولێر مافپەروەر و کارگێڕی و نووسەر و کورد پەروەر مەعروف چیاووك ١٨٨٥-١٩٥٨، گۆڤاری هەولێر، ژمارە ( ٢)، بەهار ١٩٩٩، ل ل١٨٣-١٩١؛ احمد جمال جیاووك، معروف جیاووك في دائرة الضوء، مجلة زاگروس، العدد(١٤)، ٢٧ کانون الثاني ١٩٩٩، ل ٧٢.

(١٣) معروف جیاووك، القضية الكردية، مطبعة الاستقلال، بغداد، ١٩٢٥، ص ٢٢.

**مەلیك فەیسەڵی كردووە وتوویەتی:" ... من ڕازی نەبووم لە سەر دانانی ئەرشەد عومەری و ئیسماعیل ڕەواندزی ، ئەرشەد من لێی بە گومان بووم كە نوێنەری توركی لە جنێف بە لای خۆیانی كێش بكەن و، ئیسماعیلیش گەنجە و بۆ ئەوكارە دەست نادا ..." [١٤].**

**وێڕای دانانی سنوورو بەستنی پەیمانی عیراقی توركی بریتانــــی لە ٥ی حــــــــوزەیرانی ١٩٢٦[١٥] و یەكخستنی هەوڵی دەوڵەتە هاوسێیەكان كە یەكێك لە ئامانجەكانیان بنەبڕكردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی كوردستان بوو. بەڵام ئەمجارەیان شۆڕشگێران هەوڵیاندا بە شێوازێكی تۆكمەتر بێنەوە مەیدان. هەر بۆیە ئەو سەركردە كوردانەی باكووری كوردستان كە لە ئەنجامی سەرنەكەوتنیان لە شۆڕشی ١٩٢٥[١٦] ئاوارەی پارچەكانیتری كوردستان ببوون، دەكەونە پەیوەندییەوە لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەرو پلەداری كورد لە ناو حكومەتی عیراقیدا وەك سەید تەهای نەهری لە ڕەواندزو محەمەد**

---

(١٤) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارت العراقية، الجزء الثـاني، الطبعـة السـابعة، دار الشؤون الثقافية العامة(( أفاق عربية)) بغداد، ١٩٨٨ ص ص ٧٩-٨٠.

(١٥) پەیمانی ١٩٢٦ دوای بڕانەوەی كێشــەی ویلایــەتی مووســڵ لــە نێــوان عێــراق و توركیاو بریتانیا بەسترا بۆ مەبەستی چارەسەر كردنی كێشەكانی كە لە نێوانیان دا بە هەڵواسراوی مابۆوە بە تایبەت كێشەی نەوت. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ ناوەڕۆكی پەیماننامەكە بڕوانە: د. فـاروق صـالح العمـر، المعاهـدات العراقيـة — البريطانيـة و اثرهــا في السياســة الداخليــة ١٩٢٢-١٩٤٨، دار الحريــة للطباعــة، بغـــداد، ١٩٧٧،ص١٣٩ ومابعدها؛ بيار مصطفى سيف الدين، المصدر السابق، ص ٢٦١وما بعدها.

(١٦) بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ شۆڕشی ١٩٢٥ بڕوانــە: ڕۆبــەت ئۆڵســن، سەرچاوەی پێشوو.

ئەمین ڕەواندزی[17]، ئیسماعیل حەققی شاوەیس[18] و مەعروف چیاووك لە مووسڵدا، تا بە یەكەوە نەخشەو پلانی ئەوە دابڕێژن و

(١٧) محەمەد ئەمین ڕەواندزی كوڕی مەلا حەسەنی ڕەواندزییە و ناسراوە بە ئەمین ڕەواندزی، لە ساڵی ١٨٩٨ لە ڕەواندز لە دایك بووە و هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی تەواو كردووە، ئینجا كۆلێژی سەربازی تا لە ساڵی ١٩٢٢ لە سوپای عێراقی پلەی مولازمی دووەمی وەرگرتووە و هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ چەند ئەفسەرێكیتر بەشداری لە حوكمەتی شێخ مەحموود كردووە وانەی مەشقی سەربازی لە یەكێك لە قوتابخانەكانی سلێمانی وتۆتەوە، ئەمین ڕەواندزی ڕۆڵی كاریگەری دیوە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی كوردستاندا تا لە ساڵی ١٩٤٦ خانەنشین كراوە. لە ٧ی تەشرینی دووەمی ١٩٥٥ بە نەخۆشیەكی گران كۆچی دوایی كردووە و لە گۆرستانی(باب المعظم) لە بەغدا نێژراوە. بەلاّم وسییەتەكەی نەهاتۆتە جێ كە داوای كردبوو لە سەر یەكێك لە چیایەكانی ڕەواندز بیشارنەوە. عەبدوللاّ زەنگەنە، ژیانەوە و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی كوردیدا١٩٢٤-١٩٢٦، دەزگای چاپ و بلاّوكردنەوەی موكریانی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠١، ل ل ٤٨-٤٩" كەمال رەئوف محەمەد، پەڕەیێكی وونی ڕۆژنامەنووسی كوردی یەكەم ڕۆژنامەی هەولێر، گۆڤاری كاروان، ژمارە (٤٨)، ئەیلولی ١٩٨١، ل ل ٧٤-٩٥؛ ئەمین چاوڕەش رەواندزی، مرۆڤی نیشتمان پەروەر و ڕۆژنامەنووس ئەمین ڕەواندزی، ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ، ژمارە (٦٧٥) لە ٣ ی ئایاری ١٩٩٤.

(١٨) ئیسماعیل حەققی شاوەیس، ناوی تەواوی ئیسماعیل حەققی عەلی ڕەسووڵ ئەحمەد ئاغایە و لە ساڵی١٨٩٤ لە مووسڵ لە دایك بووە، سەرەتا لە حوجرە خوێندوویەتی و لە دواتریش چۆتە قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسكەری لە سلێمانی كە لە ساڵی ١٩٠٤ خوێندنی تیایدا تەواو كردووە، ئینجا بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچێتە بەغدا لە وێشەوە بۆ ئەستەمبۆل تا قوتابخانەی جەنگیی تەواو دەكات و دەبێتە ئەفسەری سوپا و پلەی مولازمی دووەمی وەرگرتووە. ئەو كەڵە پیاوە ڕۆڵێكی كاریگەری گێڕاوە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی كوردستان تا لە ١٢ی مایسی ١٩٧٦ لە نەخۆشخانەی سلێمانی كۆچی دوایی كردووە. بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ خەباتی ئەو كەڵە پیاوە بڕوانە: دڵشاد مەحموود عەبدوڕڕەحمان، ئیسماعیل حەققی شاوەیس (١٨٩٤-١٩٧٦) توێژینەوەكی مێژوویییە(( لە بارەی چالاكییە رامیاری و

تۆڵەی قوربانیانی شۆڕشی ١٩٢٥ی باکووری کوردستان بکەنەوە[١٩]. هەر بۆیە شێخ مەهدی برای شێخ سەعیدی پیران لە نامەیەکیدا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٢٦ کە بۆ ئەمین ڕەواندزیو مەعروف چیاووك ڕەوانەی کردووە داوای هاوکاری چەكو تفاقو پێداویستی جەنگیو چەند ئەفسەرێکییان لێدەکات، بەڵام لە بەر ئامادەنەبوونی ئەمین ڕەواندزی یەکێکیتر هەڵدەستێ بە کارەکەو لە وەڵامدا لە ٢٢ی تەمووز هەندێ لە داواکاریەکانی بۆ ڕەوانە دەکات[٢٠]. کە ئەمەش جەخت لە سەر یەکڕیزیو گیانی هاوکاری نێوان شۆڕشگێڕانی کوردستان دەکات کە هەموویان یەك ئامانجیان هەبووە. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەدا ئەوەی لێرەدا جێ سەرنجە ئەوەیە کە ئەمین ڕەواندزی لەم مانگەدا بە سەردانێك دەچێتەوە ڕەواندزو هاوکاتیش هەریەك لە شێخ عەلی کوڕی شێخ سەعیدی پیران، سەید عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەبدولقادری نەهری، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزیو شێخ سەدیقی برای شێخ ئەحمەدی بارزانی هاتوونە ئەوێ[٢١]. بۆیە دەتوانرێ

---

ڕۆشنبیرییەکانییەوە))، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤.

(١٩) د. عبدالفتاح علی یحیی البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية ملاحظات تاريخية و دراسات اولية، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٦٦٩؛ ڕەفیق ساڵح، گۆڤاری دیاری کورستان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٩١.

(٢٠) د. عبدالفتاح علی یحیی البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص ص ٦٧١-٦٧٥.

(٢١) زاری کرمانجی، ژمارە ٢ ، ١٢ ذی العقدة ١٣٤٤، ل ٢٠، سەرچاوەی پێشوو.

بووتریّ، که هاتنی ئەوانە لە یەك كاتدا بۆ ڕەواندز دوورنیی‌یە بۆ ئەوە بووبێت تا بیروڕای خۆیان سەبارەت بە هاوكاریو هەماهەنگی شۆڕشگێرانی باكووری كوردستان لەگەڵ سەید تەها تاووتویّ بكەن. چونكیّ شێخ مەهدی لە دوابەشی نامەكەی‌دا داوای ئەوە لە ئەمین ڕەواندزی دەكات كە زانیاری دەربارەی كوڕەكانی شێخ سەعیدو سەید تەهاو شێخی بارزانی بۆ ڕەوان بكات[٢٢].

جێگای ئاماژە بۆ كردنە پەناهێنانی سمكۆی شكاك لە تەشرینی یەكەمی ١٩٢٦ بۆ ڕەواندز جارێكی‌تریش دەسەلاّتی ناوەندی لە ناوچەكە كردە دەرەوە، چونكیّ بە هاوكاریو هەماهەنگی سەید تەهای نەهریو خەڵكی ڕەواندز توانی دەست بە سەر ناوچەكەدا بگریّو دەسەلاّتی ناوەندی تیایدا نەهێڵیّ[٢٣]. لێرەشدا لە ڕاپۆرتێكی بریتانی‌دا هاتووە:" **... دەوروبەری كۆتایی مانگی تەشرینی یەكەم سمایل ئاغای سەرەك هۆزی شوكاك كە بە سمكۆ ناسراوە دژی حكومەتی ئێران شۆڕشی بەرپا كرد، ... خۆیو صەد كەس لە پیاوەكانی پەنایان هێنایە بەر عیراق دوای ئەوەی لە ڕێگەی توركیاوە**

---

(٢٢) د. عبدالفتاح علی یحیی البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص٦٧٣.

(٢٣) عەلائەدین سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ١٧٥-١٧٦؛ صالح محمد امین، كورد و عەجەم (( مێژوی سیاسیی كوردەكانی ئیران))، چاپی یەكەم، بیّشوێنی چاپ، ١٩٢٩، ل ٣٩١؛ یاسین خالید حسن، كردستان الشرقية دراسة في الحركة التحررية القومية فيما بين الحربين ١٩١٨-١٩٣٩، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب جامعة صلاح الدين / اربيل، ١٩٩٥، ص ١٣٢.

**نزيك نەهری سنووری بڕیو هاتە ڕەواندزی سەر بە هەولێر"[٢٤]**. ئەنجام حکومەتی عیراقی کەوتە هەڵپەی ئەوە کە هێرش بکاتە سەر ناوچەکەو سمکۆی لێبکاتە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ سەرنەکەوتنی لە هێرشەکانی ڕازی بوو کە سمکۆ لە ناوچەکانی دەوروبەری ڕەواندز بمێنێتەوە[٢٥].

به پەنابردنەوەی سمکۆ بۆ سنووری تورکیا لە مایسی ١٩٢٨ جارێکیتر هێزەکانی حکومەتی تورکی تەنگەتاویان کردو سمکۆ گەڕایەوە ئەو شوێنانەی کە لە سنووری عیراقدا لێ بوو، ئەمەش مەترسی زیاتر بۆ هەموو لایەك پەیدا کرد هەر بۆیە عەلائەدین سەجادی لەم بارەیەوە دەڵێ:"... **مەندوبی سامی بەغدا سەیری کرد ئەگەر((سمایل ئاغا)) بەمجۆرە لە سەر ئیش بڕوا، ئارەزووەکانی ئەوو تەونەکانی هەموو تێك ئەچن!. ئەمجا هێنای حکومەتی عیراقی هەڵخڕان بۆ ئەوە کە لەگەڵ حکومەتی ئێرانا قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا بۆ لە ناو بردنی((سمایل ئاغا))!. لە عەینی وەختا ئەمانەی هەموو کردو هەر دوو حکومەتەکە بە جارێ کەوتنە پەلاماردانی سمکۆ، ((سمکۆ)) لە پاش شەڕێکی زۆر دیسان گەڕایەوە بۆ خاکی تورکیا"[٢٦]**.

لێرەدا دەتوانرێ بووترێ، هاتنی سمکۆ بۆ ڕەواندزو دەوروبەریو مانەوەی بۆ ماوەیەك لەوێدا، دەسەڵاتی ناوەندی لە ناوچەکەدا

---

(٢٤) د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل ١٢١.

(٢٥) عبدالرزاق الحسنی ، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثاني، ص ص ١٩٣-١٩٤.

(٢٦) عەلائەدین سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.

نەهێشتووەو لەگەڵ ئەوەشدا مەترسیو دڵە ڕاوكێیەكی زۆری بۆ هەر دوو حكومەتی عیراقو ئێرانو دەسەڵاتدارانی بریتانی لە ناوچەكەدا دروست كردووە، هەر بۆیە بە هەموو لایەك هەوڵی خۆیان خستۆتە گەڕو هاوكاری یەكتریان كردووە. هەروەها لە دواتریش هەوڵی ئەوەیان داوە كە دەستی ئەو هاوكاریو هەماهەنگییەی سمكۆ لە باشووری كوردستان بە گشتیو ڕەواندز بە تایبەتی ببڕن كە سەید تەهای نەهری داینەمۆی ئەو هاوكارییە بووە. چونكێ ئەگەر تەماشا بكەین سەید تەهای نەهری لە ماوەی قائیمقامیەتی لە ڕەواندز دا ڕۆڵێكی كاریگەری لە بزاڤی ڕزگاریخوازی كوردستان دا بینیوە، جگە لە هاوكاری بۆ پەناهەندانی شۆڕشی ١٩٢٥ و یارمەتی دانی سمكۆ، لەگەڵ هەندێ گەورە پیاوانیتری كورد پەیوەندی بە شۆڕشگێران لە ئاراراتیشەوە كردووە[٢٧]، هەر بۆیە لە دواتر فێڵێكیان بۆ سەید تەها نایەوەو كەوتە داویەوە. لەو بارەیەوەش عەزیز شەمزینی دەڵێ:"سیاسەتی بریتانیا بە ناوەرۆك لەگەڵ بەرژەوەندییەكانی گەلی كورددا ڕێك نەدەكەوت. هەڵسوڕێنەرانی سیاسەتی ئیمپریالیستیی بریتانیا لەو بڕوایەدا بون كە بۆ ئەنجامدانی سیاسەتی ناوخۆیان دەبێ بەشێكی رابەرانی كورد لە ناو بەرن. یەكێ لەوانەش كە بڕیاری لە ناوبردنی درا سەید تەها بوو، لە بەر ئەوە ئینگلیزەكان پەنایان بردە بەر ڕەزا شاو هەر بە فیتی ئەوانیش ڕەزا شا ناردی بە شوێن سەید تەها دا و داوای لێ كرد سەری لێدا بەو بیانوەی گوایە دەیەوێ دوایی

---

(1)E.O.371/13032.Teleg.Secret.No.S.O.1587, Baghdad.July10, 1928 Secretariat of H.C.toCol.o :لە.

د. عثمان علی، المصدر السابق، ص ٥٢٧. وەرگیراوە

به گیروگرفتەکانی سەر سنوری عیراق‌و ئێران بێنیٚ‌و ئەو مەسەلانە ساغ کاتەوە کە پەیوەندی‌یان بە موڵکی تایبەتی سەید تەهاوە هەیە کە بەشێکی لە چوار چێوەی سنووری ئێران دابوو"[28]. ئیتر سەید تەها لە سەر بانگهێشتی ڕەزا شا لە ١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٨ بە سەردانێك دەچێتە تاران‌و لە ژێر پاڵەپەستۆی دەسەڵاتدارانی ئێران لە وێدا دەمێنێتەوەو لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ دەست لە کار هەڵگرتنی خۆی لە قائیمقامیەتی ڕەواندز بۆ حکومەتی عیراقی ڕەوانە دەکاتەوە[29].

شیاوی باسە، پێشتر ئاماژەمان بۆ بەشداری کردنی چەکدارانی شێخ ئەحمەدی بارزانی (١٨٩٢-١٩٦٩) لە ڕاپەڕینەکەی ڕەواندزو یەکخستنی هەوڵەکانیان بۆ یارمەتی دانی پەنابەرانی خەباتگێڕی شۆڕشی ١٩٢٥ی باکووری کوردستان کرد. بەڵام ئەگەر بێت‌و تەماشا بکەین یارمەتی ئەو دوو ناوچەیە بۆ یەکتر هەر بەوەندە ناوەستێتەوە. ئەوەتە لە کاتێکدا کە ئەحمەد بەگی بگۆك سەرۆکی عەشیرەتی باڵەکی لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ڕەواندز پشێوی دەنێتەوە هێمنی‌و ئاسایش تێك دەدات هێزێکی لیڤی دوای دەکەوێت‌و، لە تەشرینی دووەمی ١٩٢٧ پەنا بۆ شێخ ئەحمەد لە بارزان دەبات[30]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی‌تردا ڕاپۆرتێکی بریتانی لە ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٩ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە یەکێك لە پیاوەکانی شێخ ئەحمەد بە

---

(٢٨) عەزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.

(٢٩) زاری کرمانجی ، ژمارە (١٨)، ٢٧ ی ئازاری ١٩٢٩ ، سەرچاوەی پێشوو.

(٣٠) پیرەش، العراق دولة بالعنف، مطبوعات کردلوجیا رقم ٢، ١٩٨٦ ، ص ص ٣٧-٣٨.

ناوی عەلی کوڕی محیّ وتوویەتی شێخ ئەحمەد بەردەوام لە ناوچەکانی ڕەواندزو زاخۆوە نامەی بۆ دێت سەبارەت بە سەربەخۆیی کوردستان[31]. هەروەها لە ڕاپۆرتێکی‌تریشدا هاتووە کاتێك شۆڕشگێرانی ئارارات دەشکێن‌و ئاوارە دەبن شێخ ئەحمەدی بارزانی نامەی بۆ هەندێك لە سەرۆك هۆزە کوردەکان، لە وانە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی ناردووە، بە مەبەستی یارمەتی دانی ئاوارەکان[32].

ئەڵبەتە ئەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن ئەوە نیشان دەدات کە لە زووەوە شێخ ئەحمەدی بارزانی پەیوەندیی لەگەڵ ئەو ناوچەیەدا هەبووەو دەسەلاّتی پەلی هاوێشتووە بۆ ئەوێ، هەر بۆیە موتەسەڕڕیفی هەولێر لە نووسراوێکی‌دا لە ١٨ی مارتی ١٩٣١ کە بۆ پشکێنەری بریتانی لیوای هەولێر لە کەرکوك ڕەوانەی کردووە دەڵێ:" **... من پشتگیری ئەوە دەکەم کە لە ڕاپۆرتەکەتان دا هاتووە دەربارەی فراوان بوونی دەسەلاّتی شێخی بارزان بۆ ناوچەی ڕەواندز، ئەو دەسەلاّتە ئەو ڕۆ و ئەو ساڵ بە دەستی نەهێناوە، بەڵکو زیاتر لە سێ چوار ساڵ دەبێت...**"[33]. وەلێ حکومەتی عیراقی لە بەرانبەر ئەو پەل

---

(1)(Air,23/416/6088,From S.S.O.Musul to Air staff.Intelligence, Hinaidi,24,December,1929.

لە: سروە أسعد صابر، کوردستان الجنوبیة ١٩٢٦-١٩٣٩ دراسة تاریخیة، سیاسیة، اطروحة دکتورا غیر منشورة، کلیة الاداب، جامعة صلاح الدین / اربیل ، ٢٠٠٥، ص ص١٧٥-١٧٦. وەرگیراوە.

(2) Fo.730/61/1,Intelligence Report.No3, February25, 1931 S.S.O.Musal.

لە: د. عثمان علی، المصدر السابق، ص٥٨٦. وەرگیراوە.

(٣٣) ملف وزارة الداخلیة ١٩٣١، رقم الملف:٢٧/اربیل/١، موضوع الملف: حرکات السید طه وعلاقاته مع العصابات البارزانیة، متصرفیة اربیل قلم التحریرات،

هاوێشتنە دەبوو هەنگاوێك باوێت، چونكیٚ شێخ ئەحمەد لەگەڵ ئەوەی لە ناوچەكە دەسەڵاتی ئازاد بوو لە هەندیٚ كاتیش ڕێگر بوو لە بەردەم بڕیارەكانی حكومەت. ئەوەتە كاتێك حكومەت بڕیاری نیشتەجیٚ كردنی ئاشوورییەكان لە ناوچەكانی برادۆستی سەر بە ناوچەی ڕەواندز دەدات شێخ ئەحمەد بە مەترسی لە سەر دەسەڵاتەكەی دەزانیٚو دەكەوێتە دژیەوە[٣٤]. هەر لەو بارەیەوە ڕاپۆرتێكی بریتانی لە ساڵی ١٩٢٧ ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە شێخ ئەحمەدی بارزانی دەستی كردووە بە پروپاگەندەی ئەوە لە ناوچەی برادۆستدا گوایە ئاشوورییەكان لە شوێن خەڵكی ڕەسەنی ناوچەكە نیشتەجیٚ دەكەنو خەڵكەكەش ئاوارە دەكەن، هەروەها هەر لەو ڕاپۆرتەدا ئاماژە بۆ ئەوەش كراوە كە ئەو پروپاگەندەیە كاریگەری كردۆتە سەر خەڵكی ناوچەكەو پشێوی لە ناوچەكە دروست كردووە[٣٥]. بەڵاٚم دەبیٚ ئەوەش بزانیین كە شێخ ئەحمەد لە بەرانبەر ئەو بڕیارەی حكومەت هەر بەوەندە نەوەستاوە، بەڵكو لەگەڵ هەندیٚ لە ئەفسەرەكانی ناو سوپای عیراقی دەستیان كردووە بە خڕكردنەوەی واژۆی سەرۆك هۆزە كوردییەكان لە دژی ئەو كارە، بەڵاٚم كاتێك نووسراوەكە دەبەنە برادۆست بۆ لای شێخ ڕەشیدی لۆلان تا واژۆی بكات، شێخ ڕەشید لەگەڵ ئەوەی واژۆی دەكات، بەڵاٚم

---

سري، العدد٧٧/س، اربيل في ١٨/٥/١٩٣١، الى مفتش اداري لواء اربيل، الموضوع: نفوذ الشيخ البارزاني. لە : د. اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تاريخية فی دورها الفكري و السياسي (١٩٣٩-١٩٥٨)، الطبعة الثانية،، مطبعة بينايى، السليمانية،٢٠٠٥، ص ٤٦. وەرگیراوە.

(٣٤) د. عثمان علی، المصدر السابق، ص ٥٧٦.

(٣٥) پیٚرەش، العراق دولة بالعنف، ص ٤٠.

لە دواتردا خەبەر بە قائیمقامی ڕەواندز کەریم بەگ (١٩٢٨-١٩٣٢) دەدات‌و کەریم بەگیش پیاوەکە دەگرێت‌و ڕەوانەی هەولێری دەکات[٣٦].

ئەگەرچی نیشتەجێ کردنی ئاشوورییەکان لە برادۆست سەری نەگرت بە هۆی پێك نەهاتنی ئاشوورییەکان لە ناو خۆیان لە سەر زەوی[٣٧].بەڵام حکومەت هەر دڕدۆنگ بوو لە شێخ ئەحمەدی بارزانی، بۆیە دەبوو بە هەر شێوازێك بێت لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لە تەمووزی ١٩٣١ کەوتنە پروپاگەندەی ئەوەوە کە شێخ ئەحمەد لە دین هەڵگەڕاوەتەوە بۆتە مەسیحی‌و خواردنی گۆشتی بەرازی حەڵاڵ کردووە[٣٨]. لێرەشدا ئەفسەری هەواڵگریی بریتانی لە هەولێر لە ڕاپۆرتێکی‌دا لە ٢٩ی تەمووزی ١٩٣١ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە شێخ ئەحمەدی بارزانی نامەیەکی بۆ شێخ ڕەشیدی لۆلان لە ناوچەی برادۆستدا ڕەوانە کردووەو داوای ئەوەی لێکردووە کە بێتە ناو دینە نوێکەیەوە، بەڵام بە ڕەتکردنەوە ئەو داواکارییە شێخ ئەحمەد هێزێکی بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفای برای ڕەوانەی سەر شێخ ڕەشید کردووە[٣٩]. بەڵام مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا بە پێچەوانەی ئەوە باسی لە ڕووداوەکە کردووەو دەڵێ:" **کاربەدەستان**

---

(٣٦) عەلائەدین سەجادی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٤.

(٣٧) ليورا لوكيتزا، العراق و البحث عن الهوية الوطنية، ترجمة: دلشاد ميران، الطبعة الاولى، اربيل، ٢٠٠٤ ، ص ٤٨؛ امين سامي الغمراوي، قضية الاكراد في شمال العراق، الطبعة الاولى، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٧، ص ١٠٢.

(٣٨) لونكريك، المصدر السابق، ص ٣١٩.

(4)Air23/311 memorandum from S.S.O 29-7-31.

لە: د.عثمان علي، المصدر السابق، ص ٥٨٠. وەرگیراوە.

کەوتنە هاندانی هۆزەکان دژی بارزان، لە هاوینی١٩٣١ دا برادۆستییەکان پەلاماری هۆزی شێروانی ناوچەی بارزانیان داو گوندەکانی( گرکال و کۆلەو باکێ)یان تالآن کردو ماڵەکانیان سووتاند. لەو سەردەمەدا بارزانی سەردانی ئەو ناوچەیەی کرد، چەند کەسێکی کۆکردەوەو شوێن تالآنکەران کەوت تا لە دەشتی هێرت گەیشتە سەریان، پاش لێکدانێکی کوتوپڕ ماڵو مالآتی ئەو گوندانەی لێ سەندەوە. جارێکی دیکەیش پەلامار هەر لەو ناوچەیەدا روویدایەوە لە ٢٥/١١/ ١٩٣١دا، دیسان بارزانییەکان پێشی پەلاماردەرانیان گرت، شێخ ئەحمەدی بارزانی ڕۆژی ٢٧/١١/١٩٣١ وەلی بەگی بە هێزێکی گەورەوە ناردو ڕووی تێکردن، یەکەم پێکدادان برادۆستییەکان رایانکردو ئەو تالآنەی هێنابوویان بە جێیان هێشت، بەلآم وەلی بەگ بەوە وازی لێ نەهێنانو تا نێو ماڵەکانیان دوایان کەوت، لەم شەڕەدا برادۆستییەکان تووشی شکانێکی خراپ بوون"[٤٠]. بۆیە دەتوانرێ بووترێ، کە حکومەت ئەو کارەی بۆ ئەوە کردووە تا ئاژاوە لە ناوچەکە بنێتەوەو دوژمنداری لە نێوان بارزانییەکانو برادۆستییەکان دروست بکات، چونکێ تەنیا برادۆستییەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەوەوە کە شێخ ئەحمەد لە دین لای داوە، ئەگەر بزانیین یەکێکی وەکو ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی ئەو پروپاگەندەی بە درۆیەکی تەواو زانیوە[٤١].

---

(٤٠) مسعود بارزانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥.

(٤١) هاملتون، المصدر السابق، ٢٣٦.

له ڕاستیدا شێخ ئەحمەد دواتر هەوڵیدا کێشەی نێوانیان چارەسەر بکات، لەبەر ئەوەی لە ڕاپۆرتێکی ئەفسەری هەواڵگریی بریتانی لە مووسڵ هاتووە کە شێخ ئەحمەد لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٣٢ وەفدێکی ڕەوانەی لای شێخ ڕەشید کردووەو داوای ئاشتی کردووەو، بۆ نیەت پاکی خۆشی هەندێ کەلو پەلی برادۆستییەکانی ڕەوانە کردۆتەوە کە بارزانییەکان لە شەڕەکاندا دەستیان بە سەر داگرتووە[٤٢]، ئەوە لە لایەك، لە لایەکیدیکە داوای لە حکومەت کردووە کە بێتە ناوەندیانو کێشەکە چارەسەر بکات، هەر بۆیە حکومەتیش هەڵدەستێ بە پێك هێنانی لێژنەیەك لە هەردوو موتەسەڕڕیفی مووسڵو هەولێر لەگەڵ قائیمقامی ڕەواندزو زێبار، بەلاّم کاتێك لێژنەکە بە ئامادەبوونی نوێنەرانی هەر دوولا لە سەرەتای مانگی تەشرینی دووەمی ١٩٣١ لە ئاکرێ کۆدەبنەوە هیچ دەرئەنجامی لێ ناکەوێتەوە[٤٣]. ئەنجام جارێکیتریش شەڕ دەکەوێتەوە نێوانیانو چەکدارانی شێخ ئەحمەد هێرش دەکەنە سەر ناوچەکانی قەڵەمڕەوی شێخ ڕەشیدو هەندێ لە دێیەکان دەسووتێننو شێخ ڕەشیدیش ناچار دەکەن بچێتە سنووری ئێرانەوە[٤٤]. ئیتر حکومەت بەو کارەشی هیچی لەگەڵ شێخ ئەحمەددا پێنەکرا بۆیە دەبوو ڕاستەوخۆ ڕووبەرووی بێتەوە.

---

(1) CO174/11,144637 Intelligence Report No 1,January 13 1932. S.S.O.Musul.

لە: د. عثمان علی، المصدر السابق، ص ٥٨١. وەرگیراوە.

(٤٣) حسن مصطفى، البارزانيون و حركات بارزان ١٩٣٢-١٩٤٧، طبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٣، ص ٤٨؛ حامد محمود عيسى، المصدر السابق، ص ١٥٨.

(٤٤) دیڤید ماکداول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ٣٧٤.

که سەرئەنجام بە پاڵپشتی فڕۆکەکانی بریتانی توانی شێخ ئەحمەد لە ناوچەکە بکاتە دەرەوەو پەڕاگەندەی تورکیای بکات[٤٥].

دوا ئاکامی ئەو مانۆڕە سەربازییانە حکومەتی عیراقی بە هاوکاری هێزی ئاسمانی بریتانی لە ناوچەکە جارێکیتریش هێمنیو ئارامیو ئاسایشی بۆ ناوچەکانی ڕەواندز گێڕایەوە. بەم بۆنەشەوە مەلیك فەیسەڵ لە ١٦ی ئابی ١٩٣٢ سەردانێکی ناوچەکانی کوردستان دەکاتو سەر لە بنکەیەکی سەربازی لە هاوینە هەواری جوندییان دەداتو ڕۆژێکی تەواو لە وێدا دەمێنێتەوەو سەر لە دێهاتەکانی ناوچەکە دەدات[٤٦].

گەیشتن بە لوتکەی پەیوەندییەکانی حکومەتی عیراقی لەگەڵ بریتانییەکان بە گوێرەی پەیماننامەکانی کە بەستبوویان ڕێگای لە بەردەم حکومەت خۆشکرد تا لە تەشرینی یەکەمی١٩٣٢ ببێتە ئەندام لە کۆمەڵەی گەلانو سەربەخۆیی خۆی وەربگرێت. کە لێرە بەدواوە مێژووی سیاسیی عێراق بە گشتی پێ دەنێتە قۆناغێکی نوێوە، کە لەگەڵ ئەوەشدا گەلیشیەوە باری کوردستانیش گۆڕانی بەسەردا دێت.

---

(٤٥) عزيز حسن البارزاني، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق ١٩٣٩-١٩٤٥، الطبعة الاولى، دار سپيريز للطبع و النشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ص ٣٩.

(٤٦) ناجي شوكت، سيرة وذكريات ثمانين عاماً ١٨٩٤-١٩٧٤، الجزء الاول، بغداد، ١٩٩٠، ص ٢٠١.

# ڕەواندز لە قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقدا
# (١٩٣٢ - ١٩٣٩)

ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکان لە ساڵانی قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقیدا جیاوازە لە قۆناغی بەر لە خۆیو دوای خۆی، لە بەر ئەوەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە شێوازو کردارێکی جیاواز بە خۆیەوە دەبینێت. بەڵام ئەوەی تایبەتدارە بە ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لەو قۆناغەدا ئەوا لە سەرچاوە مێژووییەکان شتێکی ئەو تۆ باسی لێوە ناکرێتو ڕەوشی شارەکە دەکەوێتە کزی و لاوازی. بۆیە لێرەدا دەتوانرێ بووترێ، کە ئەو باس نەکردنەو کزیو لاوازییە لە ئەنجامی چەند هۆکارێکەوە سەریهەڵداوە کە لە خوارەوە ڕیز بەندیان دەکەینو یەکە یەکە لە سەریان دەوەستینو باسیان لێوە دەکەین:

- یەکەم:

نەمانی ڕەواندز وەکو مەڵبەندی ڕووداوو نزیك لە مەڵبەندی ڕووداو، لە بەر ئەوەی ئەگەر بێتو تەماشا بکەین ئەوا لە ساڵانی دوای داگیرکردنی ڕەواندز لە لایەن ئینگلیزەکان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، لە لایەك ڕەواندز دەبێت بە مەڵبەندی ڕووبەڕوو بوونەوەی دەسەڵاتی داگیرکاری بریتانییەکانو، لە لایەکیدیکەش بە شوێنو پەناگای ئەو کەسانەی کە لە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان

هەڵدەگەڕانەوە[٤٧]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە نیسانی ١٩٢١ بە دواوە تا ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ ڕەواندز دەبێت بە پێگەیەك بۆ پروپاگەندەی تورکەکان بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتیان بۆ ولایەتی مووسڵ. هەر بۆیە لەو سەردەمەدا ڕەواندز بە مەڵبەندی سەرهەڵدانی ڕووداوەکان دادەنرا.

لە لایەکی دیکەدا دوای گێڕانەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز بۆ ناوچەکە لە ٢٢ی نیسانی ١٩٢٣ و دامەزراندنی سەید تەهای نەهری وەکو قائیمقام لە وێدا، ئەو جارەیان ڕەواندز دەبێتە مەڵبەندی نزیك لە ڕووداوەکان، لە بەر ئەوەی ئەگەر بێتو تەماشا بکەین دەبینین ڕەواندز دەبێت بە شوێنو پەناگای ئەو کەسانە، کە لە دەسەڵات هەڵدەگەڕانەوەو ڕاپەڕینو شۆڕشیان ئەنجام دەدا، ئەوە سەرەڕای ئەوەی یارمەتیش لە ڕەواندزەوە بۆ ڕاپەڕینو شۆڕشەکانی دەورووبەر ڕەوانە دەکران[٤٨].

---

(٤٧) مەبەستمان پەناهێنانی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند و سەید محەمەدی جەباری و هاوشێوەی ئەوانن کە لە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان هەڵدەگەڕانەوە و ڕەواندز دەبووە پەناگەیان.

(٤٨) مەبەستمان پەناگای ئەوانەیە کە لە دوای سەرنەکەوتنی شۆڕشی ١٩٢٥ بە سەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران لە باکووری کوردستان لە دەسەڵاتی تورکە کەمالییەکان ڕزگاریان ببوو و هەڵاتبوونە ناوچەکە، یەکێك لە وانە سەید عەبدوڵڵای کوڕی سەید عەبدولقادری شەمزینی لە ناوچەکە پەنادرابوو، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەدا سمکۆی شکاکیش کە شۆڕشی هەڵگیرساندەوە لە ١٩٢٦ و شکا هاتە ناوچەی ڕەواندز و ماوەیەك لە وێ پەنا دراو لە لایەن سەید تەهای نەهری و خەڵکی ناوچەکەوە یارمەتی درا. ئەوەی سەرەڕای ئەوەی کە لە لایەن سەید تەها و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزیەوە یارمەتی بۆ شۆڕشگێرانی ئارارات ڕەوانە کرا. بڕوانە تەوەری یەکەمی بەشی دووەم.

شیاوی باسە لەقۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی حکومەتی عیراقی بە گشتی ڕاپەڕینی چەکداری لە کوردستان لەو ماوەیەدا نامێنێ تا ڕەواندز لە سەرچاوە مێژووییەکان وەکو مەڵبەندی ڕووداوو نزیك لە مەڵبەندی ڕووداو باسی لێوە بکرێت. لە بەر ئەوەی ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین شێخ مەحموود لە ئاوباریك لە ١٩٣١ تێك دەشکێ و[٤٩]، شێخ ئەحمەدی بارزانی و هاوڕێکانی لە دوای ئاوارە بوونیان بۆ تورکیا و گەڕانەوەیان بۆ عیراق نەفی ناوچەکانی خواروو دەکرێن[٥٠]. هەروەها شۆڕشی ئاراراتیش بە سەرۆکایەتی ئیحسان نووری پاشا[٥١] لە باکووری کوردستان لە لایەن دەسەڵاتدارانی حکومەتی تورکی بە ئاگرو ئاسن کۆتایی پێدەهێنرێ[٥٢]. ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش سمکۆی شکاك لە بۆسەیەکی دەسەڵاتدارانی

(٤٩) بۆ شکانی شێخ مەحموود لە ئاوباریك بڕوانە: م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان ، ل ٧٧٤ و بەدواوە.

(٥٠) بۆ زانیاری لە مەڕ نەفی کردنی شێخ ئەحمەد و بارزانییەکان بڕوانە: مسعود بارزانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل٤٤ -٤٨.

(٥١) ئیحسان نووری پاشا: ناوی تەواوی ئیحسان نووری کوڕی عەلی قولیە و لە ساڵی ١٨٩٣ دا لە گەڕەکی عەلی قولیی شاری بەتلیس لە دایك بووە و، ساڵی ١٩١٠ بۆتە ئەفسەری سوپا. لە پاشان ڕۆڵی کاریگەری لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لە باکووری کوردستان دەگێڕێت و سەرکردایەتی شۆڕشی ئارارات لە ساڵانی( ١٩٢٧- ١٩٣١) دەگرێتە ئەستۆ تا نوشستی هێنانی ڕوو دەکاتە ئێران و لە (تاران)ی پایتەخت دەمێنێتەوە و لە ٨ی مارتی ١٩٧٦ کۆچی دوایی دەکات. ئیحسان نوری بیتلیسی، شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، وەرگێڕانی: م. جەمیل ڕۆژبەیانی، بەغدا، ١٩٩٣، ل ل ٤-٧.

(٥٢) بۆ شۆڕشی ئارارات و ئەنجامەکەی بڕوانە: ئیحسان نوری بیتلیسی، هەمان سەرچاوە.

حکومەتی ئێران لە ١٨ی تەمووزی ١٩٣٠ تیرۆر دەکرێت [٥٣]. ئیتر ئالیەتێکی وا لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان نامێنێ تا کار بکاتە سەر ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکان لە کوردستان بە گشتیو ڕەواندز بە تایبەتی لەو قۆناغەدا.

- دووەم:

چوونی سەید تەهای نەهری بۆ تارانی پایتەختی ئێران لە١٣ی تەشرینی دووەمی١٩٢٨و دەست لە کارکێشانەوەی وەکو قائیمقامی ڕەواندز لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ هۆکارێکیتره لە هۆکارەکان، لە بەر ئەوەی سەید تەهای نەهری خاوەن دەسەلاتو نفوزێکی زۆر بوو لە ناوچەکەو لە لایەن دەسەلاتی حکومەتی عیراقیو بریتانییەکان حیسابی بۆ دەکرا. هەروەها خودی سەید تەهای نەهری خۆشی لەگەڵ سەرکردە کوردەکان پەیوەندیی باشی هەبووەو ڕۆڵی کاریگەری گێڕاوە لە ناردنی هاوکاریو هەماهەنگی بۆیان. ئیتر بە نەمانی ئەو لە ناوچەکە قائیمقامێکیتر لە ڕەواندز دەسەلاتی وەرنەگرت وەکو ئەو خزمەت بەو شارە بکاتو پەرەی پێبدات. هەر بۆیە خەڵکی ناوچەکە سەردەمی سەید تەهای نەهری بە قۆناغێکی پرشنگدار لە مێژووی ڕەواندز لە قەڵەم دەدەنو بە قۆناغی پێشکەوتنو پەیڕەو کردنی دادپەروەری باسی لێوەدەکەن [٥٤].

---

(٥٣) بۆ چۆنیەتی داڕشتنی پلانی تیرۆرکردنی سمکۆی شکاك بڕوانە: یاسین خالید حسن، المصدر السابق، ص١٣٦؛ عەبدوڵلا سەمەدی، تیرۆری سمایل ئاغای سمکۆ بە گێڕانەوەی ئاجودان هاشم-ی ئەحمەد زادە ، لە ئینتەرنێتەوە (WWW.DENGEKAN.COM/doc/2004/10/Abdullahsamade18.pdf) وەرگیراوە.

(٥٤) دیمانەیەك لە گەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

- سێیەم:

لە دەستدان و نەمانی کەسایەتیی بەناوبانگ و ناسراوی شارەکە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و کوشتنی لە دۆڵی نیشاوێ[٥٥] لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٣٣ لە ئەنجامی دوژمنداریبەکی کۆنی بنەماڵەکەی لەگەڵ بنەماڵەی باویل ئاغادا[٥٦]، کوردستانی بە گشتیی و

---

(٥٥) دۆڵی نیشاوێ دەکەوێتە سەر ڕێگای نێوان سپیلك و خەلیفان لە ژێر گوندی سەرچیایە. چالاك میرانی، پارچە هەورێکی زیندووی سەر ئاسمانی شارەکەم بیرەوەریەکانی بنەماڵەی باویل ئاغای رواندزی، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٧٨.

(٥٦) سەبارەت بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی دوژمنداری نێوان بنەماڵەی ئیسماعیل بەگ و باویل ئاغا بیروڕای جیاواز هەیە کە سەرەتاکەی بۆ کوشتنی سەعید بەگی عەولا پاشای باوکی ئیسماعیل بەگ دەگەڕێتەوە، کە ناوبراو لە ساڵی ١٩١٨ بەر لە هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ناوچەکە کوژراوە. یەکەمیان کوشتنەکە دەخەنە ئەستۆی سەلیم ئاغای حەمەدەشین کە خزمی نووری باویل ئاغایە گوایە ئەو هەڵساوە بەو کارە. دووەمیان سلێمان بەگی سیلاحشۆڕ بەو کارە تاوانبار دەکەن. سێیەمیشیان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکێك بە ناوی(مامەری باس) سەعید بەگی کوشتووە بێ ئەوەی بزانرێ کە ئەو کارەی بە قسەی کێ کردووە. جا بۆ مەبەستی پەردە لادان لە سەر ڕاستییەکان فەخری بەگی شەمسەدین بەگی سیلاحشۆڕ کە نەوەی سلێمان بەگە لە وەڵامی پرسیارێکدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد و وتی: سەرەڕای بوونی کۆنە ناخۆشییەکی سلێمان بەگ و باویل ئاغا لە لایەك و سەعید بەگ لە لایەکی دیکەوە کە بۆ سەردەمی حوکمڕانی عوسمانییەکان لە ناوچەکە دەگەڕایەوە، بەڵام سلێمان بەگ دەستی لە کوشتنی سەعید بەگ دا نەبووە، بەڵکو موسەبیب بووە، لە بەر ئەوەی سەعید بەگ سەرکێشی لە قسەی عەولا پاشای باوکی کردووە ئەویش هەڵساوە شکایەتی لای سلێمان بەگ لێکردووە و داوای ئەوەی لێکردووە کە ئامۆژگاری بکات، لە بەر ئەوەی خزمی یەکتربوون، هەر بۆیە سلێمان بەگ هەڵساوە بانگی سەعید بەگی کردووە و پێی وتووە دەبێت هەموو ڕۆژێك تۆ بێیتە

باتاس کە ئەو لەوێدا دەسەڵاتدار بووە. دەرئەنجام ڕۆژێك لە ڕێگا سەعید بەگ کوژراوە. بەڵگەی بۆ قسەکەشی ئەوە بوو کە باوکی فەخری بەگ کە دەکاتە کوڕی سلێمان بەگ لەگەڵ باوکی بەشداری پرسەنامەکەی کردووە و سلێمان بەگ وتوویەتی: دەبێت هەر خۆی تۆڵەی سەعید بەگ بکاتەوە. ئیتر سەرهەڵدانی ئەو دوژمنداریە هەر چۆنێك بوو بێت ئەوا لە دواتر لە نێوان بنەماڵەی ئیسماعیل بەگ و باویل ئاغا توندتر دەبێت، چونکە ئیسماعیل بەگ بنەماڵەی باویل ئاغای بە بکوژانی باوکی داناوە.

شیاوی باسە کاتێك ئینگلیزەکان هاتن بۆ ناوچەکە و زۆری پێنەچوو نووری باویل ئاغا سەر کێشی لە فەرمانەکانی کردن و بەندکراو لە دەست بەندییەکان هەڵات، ئینگلیزەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە کاتێك حاکمی سیاسیی بریتانی لە هەولێر فەرمانی بە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی کرد کە پیاوەکانی ڕەوانەی سەر ماڵی باویل ئاغا بکات تا کوڕەکانیتری دەستگیر بکات لە جێگای نووری دا، دەرئەنجام شەڕ دەکەوێتە نێوانیان و دوو کوڕی باویل ئاغا بە ناوی مستەفا و کەریم لەگەڵ کوڕێکی نووری دەکوژرێن، کە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد. لە بەرانبەردا بنەماڵەی باویل ئاغا لە لای خۆیانەوە وا لێکی دەدەنەوە کە ئیسماعیل بەگ بۆیە ئەو کارەی کردووە تا تۆڵەی باوکی بکاتەوە ئەگەرچی لە ڕاستی دا وانەبووە، چونکێ مستەفای عەلی باویل ئاغا دەڵێت: باوکم دەیووت: بەو دواییانە بۆ مان ڕوون بۆوە کە ئیسماعیل بەگ دەستی لە کوشتنی براکانم دانەبووە، بەڵکو یەکێك لە خاڵوانەکانی بە ناوی عەدیل ئاغا ئەو کارەی کردووە. درێژە کێشانی ئەو دوژمنداریە تەشەنە دەکات تا ئەو کاتەی کە لە ساڵی ١٩٣٣ سەباحی نووری باویل ئاغای (١٩١٨؟ -١٩٤١) لە شاری هەولێر قوتابی دەبێت لە قۆناغی ناوەندی و لە ناو شار دا دوو گوللە لە ئیسماعیل بەگ دەدات و برینداری دەکات، بەلاَم ئیسماعیل بەگ چاك دەبێتەوە و لە بەردەم مەلا فەندی و مستەفا قەرەداغی حاکمدا، ئیسماعیل بەگ دەڵێ: هەر چەندە دەستم لە کوشتنی هەردوو کوڕەکەی باویل ئاغا دا نییە، بەلاَم با ئەو دوو گوللەیەی سەباح ببێتە بەرانبەری خوێنی ئەو دوو جوانە مەرگە و لە سەباحی نووری باویل ئاغا خۆش دەبێت. کەچی مستەفا قەرەداغی حاکم لەگەڵ ئەوەشدا حوکمی حەوت ساڵ

ڕەوانـدزی بـــە تایبەتی لە داکۆکی کەرێکی سەربەخۆیی کـــوردســـتان کـرد[٥٧]. لە بەر ئەوەی بە گوێرەی قسەی هاملتۆنی[٥٨] ئەندازیار ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی هەردەم بە ئومێدی پێشکەوتن و

---

بەندی بۆ سەباحی نووری باویل ئاغا دەبڕێتەوە. نووری باویل ئاغاش ئەو کاتە کە مولازمی پۆلیس دەبێت لە دهۆك لە کاری فەرمی میری‌دا بۆ مەبەستی دڵ دانەوەی دایکی دێتەوە گوندی سەرچیا و لە ماڵی حەمەدە شین میوان دەبێت. بۆ ڕۆژی دواتریش بۆ مەبەستی بەرێکردنی نووری دێنە سەر ڕێگا و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزیش لە شەقلاوە کە میوانی ڕەشید بەگی میران بووە لەو شـەوەدا بەرەو ڕەواندز دەگەڕێتەوە و لە ڕێگادا لـە دۆڵـی نیشـاوێ هـەر دوولا بەیـەك دەگەن و دەبێتە شەڕ لە نێوانیان . عەلی باویل ئاغا دەڵێت: هەر چەندە ئێمـە بۆ بەرێکردنی نووری لە وێدا وەستا بووین، بەلاّم کار لە کار تـراز و بـوو بـە شەڕمان. ئەنجام ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و حەسەن عەبدوللاّ و حەسەن قادر دەکوژرێن و سلێمان بەگی دەرگەلەش برینداردەبێت و مامۆ ڕەوانـدزیش بـۆی دەردەچێت. لە ماڵی باویل ئاغاش مەلا عەزیزی کوڕی باویل ئاغا و حەسەنی حـاجی عەبـدولڕەزاق دەکـوژرێن و نـووری و عـەلی باویـل ئاغـاو سـەلیمی حەمەدەشینی بریندار دەبن. شیاوی باسـە حکومـەتی عێراقـی بڕیـاری بەنـد کردنی نووری و عەلی باویل ئاغا و سـەلیمی حەمەدەشـینی دەدات ئـیتر دوای هەشت ساڵان بە فەرمانی پادشای لە ١٩٤١ بە یارمەتی یونس سەبعاوی کـە ولاش زاوای نووری باویل ئاغای دەبێت بەر دەبن. ئەسـعەد عـەدۆ، سەرچـاوەی پێشوو؛ دیمانەیەك لەگـەڵ فـەخری شەمسـەدین بـەگی سیلاحشـۆڕ لـە ٢٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر؛ دیمانەیەك لەگەڵ زولێخا حوسێن حەمەد لـە ٢٠ی تەمووزی ٢٠٠٥ هەولێر؛ دیمانەیەك لەگەڵ فەرهاد سەباح نووری باویل ئاغا لە ٢٠ی تەمووزی ٢٠٠٥ هەولێر" دیمانەیەك لەگەڵ مستەفا عـەلی باویـل ئاغـا سەرهەنگی پۆلیس و بەڕێوەبـەری بەندیخانـەی هـەولێر لـە ١٩ی حـوزەیرانی ٢٠٠٥.

(٥٧) معروف جیاووك، ماساة بارزان المظلومة، الطبعة الثانیة، اربیل، ٢٠٠١، ص ٨٤.

(٥٨) هاملتون، ناوی تەواوی( ای. ام. هاملتون)ە کە سەر پەرشتی ڕێگای هەولێر - ڕەواندز - ڕایەتی کرد و لە دواتریش ڕێگاکە بە ناوی ئەوەوە ناوی دەرکرد.

سەربەخۆیی‌ی کوردستان بووەو ئەوەی بۆ دەسەڵاتدارانی ئینگلیز دووبارە کردۆتەوە کە پێویستە کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەکو سویسرای لێبێت[٥٩]. بۆیە دەتوانرێ بووترێ، بە لە دەستدانی ئەو کەڵە پیاوە خەسارەتێکی گەورە لە مێژووی گەلی کورد کەوتووە کە جێگای مەترسی عەرەبەکان‌و ڕیزی دوژمنەکانی بووە[٦٠]. هەروەها لە دەستدانی ئیسماعیل بەگ‌و کوشتنی کاریگەریەکی زۆری هەبووە لەسەر ناوچەکە بە گشتی‌و ڕەواندز بە تایبەتی ئەگەر بزانیین دوژمنداریەکە لە دواتر ڕەواندزی کردووە بە دوو بەشەوەو باری شارەکەی شڵەژاندووە[٦١].

---

(٥٩) هاملتون، المصدر السابق، ص ٢٣٤.

(٦٠) ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی دەڵێ: " عەرەبەکان بەردەوام دەیان ووت ( اللهم احفظنا من شر إسماعيل بگ،ومعروف جياووك)" ، مستەفای عەلی باویل ئاغاش دەڵێ:" باوکم تا مردیش وێنەیەکی ئیسماعیل بەگی لە ماڵەوە هەڵواسیبووو لە سەر وێنەکەی نووسیبوو بریا ئەو گوللەی لە تۆم دا لە چاویی خۆم بدابا خوا ئەو دەستە ببڕێ کە دوژمنداری خستە نێوانمانەوە...". دیمانەیەك لە گەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر، دیمانەیەك لەگەڵ مستەفا عەلی باویل ئاغا سەرهەنگی پۆلیس و بەڕێوەبەری بەندیخانەی هەولێر لە ١٩ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ ، هەولێر.

(٦١) دوژمنداریيەکە ئەوەندە کاریگەری کردۆتە سەر ڕەوشی ناوخۆی ڕەواندز، ماڵی باویل ئاغا کە لە گەڕەکی سەرەوە بوون ئەگەر کارێکیان هەبوایە دەبوو یەکێك ڕەوانە بکەن و ماڵی ئیسماعیل بەگیش لە گەڕەکی خوارەوە بە پێچەوانەوە. دیمانەیەك لەگەڵ فەرهاد شاکر مەجرووم لە ٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ ئوتێل ئاشتی سلێمانی" دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

- چوارەم:

داخستن‌و دەرنەچوونی گۆڤاری زاری کرمانجی خالێکی تری کاریگەریەکە بوو[٦٢]، لەبەر ئەوەی زاری کرمانجی لە ژمارەکانی‌دا وەکو سەرچاوەیەکی مێژوویی وابوو بۆ گێڕانەوەو نووسینەوەی مێژوو و ڕووداوەکانی ناوچەکە. هەر بۆیە ئەگەر بێت‌و سەیر بکەین دەبینین چەندین هەواڵی جیاجیاو ڕووداوەکانی، کە ڕۆژانە لە ناوچەکە ڕوویداوە نووسیوەتەوە باسی لێوە کردووە. بۆ نموونە فلانەکەس هاتە ڕەواندزو فلان سەردانی کردو فلان لە وێدا حەسایەوەو چەندان شتی‌تر لە جۆرە بابەتانە[٦٣]. ئیتر بە لە دەست دانی ئەو گۆڤارە سەرچاوەیەکی سەرەکی مێژوو و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ناوچەکە ون بووەو لە بەردەستان نەماوە.

---

(٦٢) گۆڤاری زاری کرمانجی دوای دەرچوونی ٢٤ ژمارە لە ٢٣ی تەمووزی ١٩٣٢ وەستێنرا. حوسێن حوزنی موکریانی لە بیرەوەریەکانی‌دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕەزابەگی ئیسماعیل بەگ قائیمقامی ڕەواندز( ١٩٣٢-١٩٣٥) جەلال بابانی موتەسەڕیفی هەولێری لێهانداوە بە ڕادەیەکی وا کە چاپ کردنی گۆڤاری زاری کرمانجی لێ قەدەغە بکات‌و مۆڵەتی بلاوکردنەوەی لێ وەربگرێتەوە، چونکێ ڕەزا بەگ زۆر هەوڵی داوە لەگەڵ حوسێن حوزنی موکریانی‌دا تا چاپخانەکەی بگوازێتەوە بۆ شاری سلێمانی تا لە وێدا دەنگ بداتەوە نەوەك لە ڕەواندز، هەروەها زۆر جاریش ئەوەی پێوتوە کە پێویستە بچێتە سلێمانی و لە ڕەواندز چی هەیە؟ و لەوێدا چاپخانە دابمەزرێنێ و لەگەڵ نەوجەوانەکانی ئەوێدا ڕێك بکەوێ. حسێن حوزنی موکریانی، بەرهەمەکانی ، ئامادەکردنی د. کوردستان موکریانی، لە ژێر چاپکردن دایە، ل ل ٩، ٣٢.

(٦٣) بۆ زانیاریی زیاتر لە مەڕ ئەو بابەتە سەیری ژمارەکانی زاری کرمانجی بکە کە ڕۆژانە هەواڵەکانی نارچەکەی بلاوکردۆتەوە.

- پێنجەم:

گواستنەوەی کاری سیاسی لە دەست شێخو سەرۆك هۆزو ئاغاکان بۆ دەستی قوتابیان لەو قۆناغەدا ڕووداوەکانی لە ڕەواندز دوورخستەوە، لە بەر ئەوەی لەو سەردەمانەدا تەنیا قوتابخانەی سەرەتایی لە ڕەواندز هەبوو، بۆیە دەبوو قوتابییان بۆ تەواو کردنی خوێندن ڕووبکەنە هەولێر و کەرکوك دواتریش شاری بەغدای پایتەخت تا لە وێدا خوێندن تەواو بکەن، بەمەش زۆر ڕۆڵەی نیشتمانپەروەری لە ڕەواندز دووردەخستەوە. ئەگەرچی ئەو نیشتمانپەروەرانە لە شارەکانی هەولێرو کەرکوك لە کار نەکەوتوونو تێکەلاوی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە دەبوون، کە لە وێدا بوونیان هەبووەو لە کاتی گەڕانەوەشیان بیروڕاکانی ئەو کۆمەلانەیان بۆ ڕەواندز دەگوێزایەوە[٦٤]. ئەوە سەرەڕای ئەوەی دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە قوتابیەکانی خەڵکی ڕەواندز هەر بە وەندە نەوەستاون، بەڵکو بە هاوکاری لەگەڵ قوتابییانی شاری کۆیە لە شاری هەولێر شەوانە بلاوکراوەیان لە دژی کارو کردەوەکانی حکومەت لە دیوار دەداو دەکەوتنە بەر ڕێژنەی گوللەی حەس حەسەکانی حکومەتەوە[٦٥].

- شەشەم:

سەپاندنی دەسەلاتی ڕەهای حکومەتی عیراقی لە کوردستان بە گشتیو ڕەواندز بە تایبەتی دوای دروست کردنی ڕێگای گەلی عەلی

---

(٦٤) بۆ زانیاری زیاتر لە مەڕ ڕۆڵ و چالاکی ڕەواندزییەکان لە کۆمەڵە و ڕێکخرواەکانی ئەو سەردەمە بڕاونە: بەشی سێیەم تەوەرەی دووەم.

(٦٥) دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

بەگ کە ناسراوە بە ڕێگای هاملتۆن، کە مەبەست زیاتر کار ئاسانی کردن بوو بۆ دروست کردنی ئۆردووی سەربازی‌و بنکەی پۆلیسی بۆ ڕێگرتن لە بەردەم ئەو کەسانەی کە لە ناوچەکە شك‌و گومانی ئەوەیان لێ دەکرا کار بۆ بلاۆکردنەوەی بیری نەتەوەیی‌و پێگەیاندنی لاوان‌و خەڵکی ناوچەکە دەکەن. ئەوەتە حوسێن حوزنی موکریانی(٦٦) لە بیرەوەرییەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چەندین جار لە لایەن دەسەلاّتدارانی حکومەت ئازارو ئەزیەت دراوەو گۆبەندی بۆ نراوەتەوە(٦٧). لە بەر ئەوەی زانیویانە ناوبراو کاریگەری لە سەر بیروباوەڕی خەڵکی ناوچەکە هەبووەو خەڵکی ناوچەکەش شایەدی

---

(٦٦) حوسێن حوزنی موکریانی، کە بە حوزنی و داماو و خدۆك ناسراوە کوڕی سەید لەتیف موکریانی‌یە و لە ٢٢ی تەشرینی یەکەمی ١٨٩٤ لە گەڕەکی حەسەنیانی شاری مەهاباد لە دایك بووە، ساڵی ١٩٠٦ مەهابادی جێ هێشتووە و لە ساڵی ١٩١٥ لە ئەڵمانیا چاپخانەیەکی کڕیوەو هاتۆتەوە حەلەب دەستی بە کاری چاپکردن کردووە. لە ساڵی ١٩٢٥ دێتە ڕەواندزو چاپخانە دادەمەزرێنێ و یەکەمین ژمارەی گۆڤاری زاری کرمانجی لە ٢٥ی مایسی ١٩٢٦ لە ڕەواندز دەردەکات‌و بەردەوام دەبێت تا ٢٣ی تەمووزی ١٩٣٢ کە سەرجەم ژمارەکانی ٢٤ ژمارەیە. دواتریش کارەکانی دەگوازێتەوە سلێمانی و دواتریش هەولێر و گۆڤاری رووناکی لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥ دەردەکات تا ١٦ی مایسی ١٩٣٦ کە سەرجەم ژمارەکانی ئەو گۆڤارەش یازدە ژمارەیە ، حوسێن حوزنی لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی دەچێتە شاری بەغدا و سەرپەرشتی گۆڤاری دەنگی گێتی تازە دەکات . ناوبراو خزمەتێکی زۆری بزووتنەوەی ڕۆشنبیری کوردی کردووە و چەندین کتێبی بە نرخی بە چاپ گەیاندووە تا ساڵی ١٩٤٧ کۆچی دوایی کردووە. حسێن حوزنی موکریانی، بەرهەمەکانی" عەبدوڵلا سەمەدی، ناودارانی موکریانی، (/doc/2005/5Abdullahsamade5.pdfWWW.DENGEKAN.COM) لە ئەنتەرنێتەوە، ل١٨.

(٦٧) حسین حوزنی موکریانی، بەرهەمەکانی،ل ل ٩-١١.

ئەوەی بۆ دەدەن کە وەکو مامۆستایەکی بلاْوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی بووەو کاریگەری هەبووە بە سەر هەندێکیانەوە[٦٨].

- حەفتەم:

دووری ڕەواندز لە بەغدای پایتەخت هۆکارێکیترە بۆ بەشدار نەکردنی ناوچەکە لە هەندێ ڕووداو کە لە مێژووی عیراق لەو سەردەمە بە گرنگ دادەنرێت، لە بەر ئەوەی ڕەنگە هەندێ ڕووداو و گۆڕانکاری لە دەسەلاْت ڕوویدا بێت کاریگەری نەکردبێتە سەر ڕەواندزو لە ناوچەکە دەنگی نەدابێتەوە. چونکە سەبارەت بە کاریگەری کودەتاکەی بەکر سدقی[٦٩] لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦ [٧٠] لە سەر ڕەواندز هەر ئەوەندەمان لە بەر دەستە کە محەمەد

---

(٦٨) دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر؛ دیمانەیەك لەگەڵ ئازاد جوندیانی بەرپرسی دەزگای ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، ٩ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ سلێمانی.

(٦٩) بەکر سدقی کوڕی شەوقی لە ساڵی ١٨٩٠ لە بەغدا لە دایك و باوکێکی کورد لە دایك بووە، ساڵی ١٩٠٨ لە کۆلێژی سەربازی تورکی لە ئەستەنبۆل تەواوکردووە و لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی پلەی بەرزبۆتەوە بۆ موقەدەم. ناوبراو ساڵی ١٩٢١ پەیوەندی بە سوپای عێراقییەوە کردووە و لە ساڵی ١٩٢٨ پلەی بەرز بۆتەوە بۆ سەرهەنگ. هەروەها بەشداری لە چالاکی لێدانی ئاشوورییەکانی لە سمێل کردووە. ئیتر پلەی بەرزبۆتەوە تا بۆتە فەریق. بەکر سدقی سەرکردایەتی کودەتای ساڵی ١٩٣٦ی کردووە تا لە ئابی ١٩٣٧ لە مووسڵ تیرۆرکرا. نجدة فتحي صفوة، العراق في الوثائق البريطانية سنة ١٩٣٦، الطبعة الأولى ، جامعة البصرة، ١٩٨٣، ص ٦٠؛ د. كمال مظهر احمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر" دراسات تحليلية"،الطبعة الأولى، بغداد، ١٩٨٧، ص ص ١١٩، ١٢٩.

(٧٠) بۆ زانیاری زیاترلە مەڕ کودەتاکەی بەکر سدقی و دامەزراندنی حکومەتی حیکمەت سلێمان بڕوانە: حازم المفتي، العراق بين عهدين ياسين هاشمي و بكر صدقي، مطبعة سومر، بغداد،١٩٩٠ .

عەلی ئاغای جوندیانی بە هۆی هاوڕێیەتی‌و نزیکایەتی لەگەڵ بەکر سدقی‌داو دوای دامەزراندنی حکومەتی حیکمەت سلێمان( ١٨٨٩-١٩٦٤) لە ٢٩ی تەشرینی یەکەمی ١٩٣٦ تا ١٧ی ئابی ١٩٣٧ دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران‌و ئەو ماوەیە لە بەغدا دەمێنێتەوە[٧١].

ماوە بلێین سەرباری ئەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن. ئەو گۆڕانکارییە هزرییەی کە جیهان بە خۆیەوەی بینی دوای هاتنە سەر حوکمی نازییەکان لە ئەڵمانیا لەِ ساڵی ١٩٣٣ کە ئەدولف هیتلەر[٧٢]

---

(٧١) دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

(٧٢) ئەدولف هیتلەر، ساڵی ١٨٩٠ لە شاری برنو کە دەکەوێتە نێوان سنووری ئەڵمانیا و نەمسا لە دایك بووە، باوکی فەرمانبەرێکی ئاسایی گومرك بووە. هیتلەر لەگەڵ ئەوەی تەمەنی بچووك بووە، بەلاّم زۆربەی کاتەکانی خۆی بە بیرکردنەوە لە داهاتوو و خوێندن بە سەر بردووە و لە سەر داواکاری باوکی هیتلەر چۆتە خوێندنی هونەری و بەسەرکەتوویی قۆناغی خوێندنی بڕیوە. مردنی باوکی لە تەمەنی سێزەدە ساڵی و دایکیشی لە دوای باوکی کاریگەری لە سەر ژیانی هیتلەر کردووە. ناوبراو بەشداری لە جەنگی یەکەمی جیهانی کردووە و لە ئابی ١٩١٩ پارتی کرێکارانی ئەڵمانی سۆسیالیستی نیشتمانی دامەزراندووە کە بە پارتی نازی ناسراوە. ناوبراو کەسایەتییەکی شۆڤێنی بووە لە بیروڕاکانی بە تایبەت بۆ نەتەوەی ئەڵمانی. هیتلەر بەردەوام دەبێت بۆ بەدەست هێنانی هیوا و ئاواتەکانی تا ئەو کاتەی کە لە ناو حکومەتی ئەڵمانی پلەی بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە پلەی سەرۆکی حکومەت، لە بەر ئەوەی یەکێك لە ئارەزووەکانی هیتلەر دەست بە سەر داگرتنی تەواوی جیهان بووە کە ئەوەش لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی ڕەنگ دەداتەوە، بەلاّم بەو ئاواتەی نەگەیشتو لە جەنگدا شکاوە. بۆ زانیاری زیاتر لە سەر هیتلەر بڕوانە: أدولف هتلر، كفاحي، الطبعة الثانية، دار الكتب الشعبية، بيروت، لبنان

سەركردايەتیی دەكردو كاریگەری كردە سەر زۆربەی ولاّتانی جیهانی. كوردستانیش وەكو بەشێك لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لێی بێبەش نەبوو چونكێ هیتلەرییەكان لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٥ بە شێكی تایبەتییان لە ڕۆژهەلاّت دامەزراند بۆ مەبەستی بلاّوكردنەوە بیروباوەڕەكانیان‌و كاریگەرییان لە سەر خەڵكی ناوچەكە[٧٣]. ئەوەتە شایەدحاڵێك لە ڕەواندز ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە خەڵكی زۆر تامەزرۆی گوێ گرتن بوون لە هەواڵەكانی ئەو ڕادیۆیەی كە ئەڵمانەكان تیایدا پروپاگەندەیان بۆ خۆیان دەكردو ڕۆژانە خەڵكی لە شەقام‌و چایخانەكانی ڕەواندز گوێیان بۆ ئەو هەوالاّنە رادەگرت‌و ئەوەیان دووبارە دەكردەوە كە كوردو ئەڵمان ئاری نەژادن[٧٤]. بەلاّم ڕەنگە هەر ئەو ڕادیۆیەو پروپاگەندە كردن بۆ ئاری نەژادی ئەڵمانەكان تاكە ئامرازی بلاّوبوونەوەی بیروباوەڕی نازییەكان نەبووبێت لە ناوچەكەدا، بەڵكو دوژمنداری خەڵكی ناوچەكە بۆ ئینگلیز و ڕووسەكان لە لایەك و[٧٥]

---

١٩٧٥؛ د. عبدالوهاب القيسي، د. عبدالجبار العطوي، د. طارق نافع الحمداني، تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥، الموصل ، ١٩٨٣، ص ٩٨-١٠٠.

(٧٣) نصيف جاسم عباس الاحبابى، العلاقات بين إيران و ألمانيا النازية ١٩٣٣-١٩٤٥، رسالة ماجستير منشورة، مقدمة إلى كلية الآداب، جامعة بغداد ١٩٨٩، ص ٥٥

(٧٤) دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

(٧٥) زۆر بوون ئەوانەی كە دژی دەسەلاّتداری ئینگلیزەكان بوون لە ڕەواندز و چەوسانەوەیان لە دەستی ئەوانەوە دیبوو بۆیە بۆ دوژمنێكی ئینگلیزەكان دەگەڕان. هەروەها خەڵكی ڕەواندز هێشتاكە ئەو ئازار و ئەشكەنجانەیان لە بیر نەچووبۆوە كە لە دەست ڕووسەكان لە كاتی جەنگی یەكەمی جیهان چەشتبوویان. بۆیە ڕەنگە

چالاکیی سیخوڕەکانی ئەڵەمان لە ناوچە سنورییەکانی ئێران لە لایەکیدی[٧٦] ، کاریگەری بیروباوەڕی نازییەتی ئەڵمانی بۆ ناوچەکە گواستبێتەوە.

ئیتر هەر ئەو دووپارچە بوونەی جیهان بوو جارێکیتر جیهانی لە ئەیلولی ١٩٣٩وە خستە ناو جەنگێکی ماڵکاولکاریترەوە کە زەرەرمەندی لە جەنگی یەکەمی جیهانی زۆر زیاتر بوو، لە مێژووشدا بە جەنگی دووەمی جیهان( ١٩٣٩-١٩٤٥) نێوی دەرکرد.

---

ئەڵەمانەکانیان بە دۆستی خۆیان زانیبێ چونکێ دوژمنی ئینگلیز و ڕووسەکان بوون، کورد گۆتەنی دوژمنی دوژمنم دۆستەمە.

(٧٦) بۆ مەبەستی زانیاری زیاتر لە مەڕ چالاکی سیخوڕە نازییەکان بڕوانە: نصیف جاسم عباس الاحبابی، المصدر السابق، ص ٦٩ و مابعدها.

# ڕۆڵ و چالاکیی ڕەواندزییەکان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقدا

حکومەتی کاتیی عیراق لە ١٦ی‌کانوونی یەکەمی١٩٢٠ ڕەزامەندی لە سەر هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزراندن دا، بەلاّم بە هۆی هاتنی فەیسەڵو بوونی بە مەلیکی عیراق مەسەلەکەی دواخست تا٢٤ی تەشرینی یەکەمی١٩٢٢. کاتێکیش هەڵبژاردن دەستی پێکرد هێشتا ناوچە کوردییەکان بە گشتی ئارام نەبوو بوونەوە بە هۆی پشێوی لە ناوچە کوردییەکان لە لایەك و، بوونی هێزەکانی تورك لە ڕەواندزو ناوچەکانی دەوروبەریدا لە لایەکی دی، هەر بۆیە لە کۆتایی کانوونی دووەمی ١٩٢٣ کارەکانی هەڵبژاردن ڕاوەستا[٧٧].

دەرکردنی تورکەکان لە ڕەواندزو شێخ مەحموود لە سلێمانی ڕێگای لە بەردەم حکومەت خۆشکرد تا هەڵبژرادن دەست پێبکاتەوە، هەر بۆیە لە ١٢ی تەمووزی١٩٢٣ دەست بە هەڵبژاردن کرایەوەو، لە دوو ڕۆژی دواتر وەزارەتی ناوخۆ داوای لە پشکنەری کارگێڕی بریتانی لە هەولێر کرد کە دەنگو باسی ناوچەکەی سەبارەت بە هەڵبژاردن بۆ ڕەوانە بکات، پشکنەری کارگێڕیش لە وەلاّمدا لەگەڵ ڕەوانەکردنی هەواڵەکان ئەوەی بە بیر حکومەت هێنایەوە کە قائیمقامو خەڵکی ڕەواندز ئارەزووی بەشداری کردن لە هەڵبژاردن دەکەنو بە گوێرەی

---

(٧٧) د.محمد مظفر الادهمي، المصدر السابق، ص ص ٢١-٢٢ .

توانا کار بۆ جێبەجێ کردنی ڕێنماییەکان دەکەن[78]، بەڵام دەتوانرێ بووترێ، کە ئەو بۆچوونەی پشکنەری کارگێڕی بریتانی لە ڕاستیەوە دوور بووە، چونکێ کاتێك موتەسەرڕیفی هەولێر فەرمان بە سەید تەها دەدات کە هەڵبستێ بە دامەزراندنی سێ مەئمور بە شێوەی گرێ بەستی کاتی بۆ مەبەستی ناونووس کردنی خەڵکی ناوچەکە، سەید تەها گومانی خۆی لەو ناونووس کردنە پێڕادەگەیەنێتو داوای ئەوەی لێ دەکات کە ڕێنماییەکانی تایبەت بە سیستەمی هەڵبژاردنی بۆ ڕەوانە بکات. هەر بۆیە لە ناوچەکەدا هەڵبژاردن ڕووبەرووی تەنگژە دەبێتەوەو دەفتەری زانیارییەکان سەبارەت بە ڕەواندزو دەورووبەری دوادەکەوێت، ئەگەرچی سەید تەها لە پاشان هەڵدەستێ بە دامەزراندنی لیژنەیەك، بەڵام ئەو لیژنەیە ناتوانێ زانیاری تەواوی ناوچەکە بە حکومەت بداتو، تۆماری ڕەواندز لەو هەڵبژاردنە لە سەر بناغەی تەخمین پشتی پێدەبەسترێت[79].

ئەنجومەنی دامەزرێنەر لە ٢٧ی مارتی١٩٢٤ دەستی بە کارەکانی کردو لە کۆی ١٠٠ ئەندام هەژدە ئەندامی کورد بوون کە لە ناویانا عەبدوڵڵا موخلیس بەگ نەوەی پاشای گەورەی ڕەواندزی تێدا بوو. یەکێك لە کارەکانی ئەو ئەنجومەنە پەسندکردنی پەیمانی ١٩٢٢ی عیراقی بریتانی بوو، بەڵام کاتێك ئەنجومەن پەیمانەکە دەخاتە دەنگ دانەوە نوێنەرە کوردەکان داوای ئەوە دەکەن کە پەسند کردنی

(٧٨) نفس المصدر، ص ص ٩٥-٩٦.

(٧٩) نفس المصدر، ص ص ٩٧-٩٨.

پەیمانەکە دوا بخرێت تا کێشەی مووسڵ چارەسەر دەکرێت، کەچی بێ گوێدانە ئەو داواکارییە ئەنجومەن پەیمانەکە پەسند دەکات[80].

لە لایەکی‌تردا ئەنجومەنی دامەزراندن دەبوو کار بۆ ئەوە بکات‌و زەمینە بۆ ئەوە خۆشکات تا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران ئەنجام بدرێت. هەر بۆیە لە ئەنجامی کارەکانی ئەو ئەنجومەنە بوو حکومەتی عیراقی بڕیاری دامەزراندنی ئەنجومەنی نوێنەرانی‌دا و لە ١٦ی تەمووزی ١٩٢٥ یەکەمین ئەنجومەنی نوێنەران دەستی بە کارەکانی خۆی کرد کە ژمارەیەك نوێنەری کوردی تێدا بوو، لە وانە: عەبدوڵڵا موخلیس بەگ‌و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی کە نوێنەری هەولێر بوون. ئەنجومەنی نوێنەران لە یەکێك لە دانیشتنەکانی دوای بڕانەوەی کێشەی مووسڵ پرۆژەی پەیمانی عیراقی بریتانی لە ساڵی ١٩٢٦ خستە بەردەم ئەندامانییەوە، لێرەشدا وێڕای نارەزایی هەندێ لە ئەندامانی بە کۆی پەنجاو هەشت دەنگ پەیمانەکە پەسند کرا کە هەر یەك لە عەبدوڵڵا موخلیس بەگ‌و ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی لە گەڵ ڕازی بووان بوون لە سەر پەیماننامەکە[81].

شیاوی باسە، کاتێك هەواڵی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەنگی دایەوە نوێنەرە کوردەکان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقیدا کەوتنە خۆو زنجیرەیەك کۆبوونەوەیان لە نێوان خۆیان لە ماڵەکانیان لە بەغدا بۆ

---

(٨٠) عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات، الجزء الاول، ص ص ٢٣٣-٢٣٦؛ ڕەمەزان داودی، هەڵوێستی کورد لە دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق ١٩٢١-١٩٣٠، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە( ٩)، هەولێر، کانوونی یەکەم ١٩٩٨، ل ٤٠.

(٨١) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات، الجزء الثاني، ص ٤٥؛ د.عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية دراسات ووثائق، ص ٦٧.

مەبەستی تاووتوێ کردنی مەسەلەی دروست کردنی حکومەتێکی کوردی سازدا، لە کۆبوونەوەی ١٣ی شوباتی ١٩٢٦ کە لە ماڵی عەبدوڵلاّ موخلیس بەگ بەسترا، عەبدوڵلاّ موخلیس بەگ ئاماژە بۆ بیروڕای هەندێ لە نوێنەران دەکات کە گاڵتەیان دێ بە دروست کردنی حکومەتێکی سەربەخۆیی کوردی، هەڵگرانی ئەو بیروڕایەش بەوە تاوانبار دەکات کە هەڵپەی ئەوەیانە پلەوپایەی گرنگ لە دەوڵەت وەربگرن. چونکێ لەو کۆبونەوەیەدا ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی وتبووی:" **... کورد لە ناو خۆیدا نارێکەو یەك نەگرتووەو نازانێ چۆن خۆی بپارێزێ ئیتر چۆن دەبێ بە تەمای کارێکی وا گرنگ بێ کە سەر بگرێ...**" [٨٢]. بەلاّم دەبینین لە دانیشتنی دووەمیان هەر لە ماڵی عەبدوڵلاّ موخلیس بەگ لە ١٩ی شوباتی ١٩٢٦ لە سەر ئەوە ڕێك دەکەون کە نامە ئاراستەی ناوچە کوردییەکان بکەن تا لە کوردستان بە گشتی پروپاگەندە بۆ دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردی بکرێ، لەو بارەیەوەش ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە هەفتەی ڕابردوو پەیوەندی لەگەڵ سەید تەهای نەهری قائیمقامی ڕەواندز کردووە [٨٣].

وێڕای ئەو دەنگ باسو سەرگەرمییە نوێنەرانی کورد دڵنیابوون کە هیچیان پێناکرێت، هەر بۆیە لە کۆبوونەوەی ٢ی مارتی ١٩٢٦ لە

---

(٨٢) م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان، بەرگی دووەم، ل ٦١٠.

(٨٣) م. ر. هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان... ، بەرگی دووەم، ل ٦١١. تێبینی ئەو کۆبوونەوانە لە ماڵی ئەندامەکانی‌تریش ئەنجام دراون، بەلاّم زۆربەی کۆبوونەوەکان لە ماڵی عەبدوڵلاّ موخلیس بەگ بووە، ڕەنگە ماڵەکەی ئەو شیاوتر بووبێت لە ماڵەکانی تر .

ماڵی عەبدوڵڵا موخلیس بەگ لە بیروڕاکانی پێشوویان پاشەگەز دەبنەوە ئەگەرچی ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی دەڵێ: "... **پێویستە هەموو یەك بگرن دەربارەی مەسئەلەی کورد بە تایبەتی نائبە کوردەکان ...**"[٨٤]. بەلاّم دەبینین عەبدوڵڵا موخلیس بەگ ئاوێك دەکات بە سەر ئەو جۆش‌و خرۆشەی کە لە ناو نوێنەراکان هەبووەو دەڵێ:" **چ کوردو عیراق ئازادییان بە شان‌و باهووی خۆیان دەسگیر نەبووە بەڵکو ئینگلیز ئازادی کردوون لەبەر ئەوە دەبێ گوێ بۆ ئەو دۆستەیان رابیێڵن‌و بۆی روونکردوونەوە کەوا هیچ شتێکی وا لە ئارادا نییە کە باسی پێك هێنانی حکومەتێکی کورد بکرێ هەر وەکو ئیسماعیل ڕەواندزی‌و ئەوانی‌تر بۆی چوو بوون...**"[٨٥]. لێرە بەڵگەنامەیەکی بریتانی کە ڕاپۆرتێکی پۆلیسی بەغدای تیادایە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە ٢٠ی مارتی ١٩٢٦ عەبدوڵڵا موخلیس بەگ‌و عەلی ڕەفیق خادم سەججادە کۆبوونەتەوەو لە سەر ئەوە ڕێکەوتوون کە واز لە داواکاری ئۆتۆنۆمی‌و نامە ناردن بۆ ناوچە کوردییەکان بهێنن‌و جارێکی‌تریش باس لەو جۆرە باسانە نەکەنەوە، لەبەر ئەوە لیێکۆڵەرێك دەڵێ:" **بەلای منەوە وایە کە دەبێ لە وانەی بەشداریی ئەو کۆبوونەوانە بوون پەیوەندییان بە ئینگلیزەکانەوە هەبووە چونکە کە دەڵێ ڕاپۆرتی شرطە دەبێ بزانرێ کە لەو ڕۆژانەدا شرطە ی بەغداد هەر ئینگلیزەکان خۆیان سەر پەرشتیان کردووە... جگە لەوە ئەو ڕاپۆرتەی کە لەو دۆکیومەنتەدا هەیە لەوە دەچێ تەنها هەر ڕاپۆرت نەبووبێ بەڵکو جۆرە (تعهد)ێك بووە لە عبدالله مخلص**

---

(٨٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٦١٣.

(٨٥) هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

**بەگو عەلی رفیق خادم السجادە وەرگیاوە و دیارە وەکو تاوانبارێك لەو رووەوە پرسیارو وەرام کراوەو ئەنجامی ئەوە کراوە بەو ڕاپۆرتە"[٨٦].**

چالاکی نوێنەرە کوردەکان لە ئەنجومەن هەر بەردەوام بوو ئەوەتە لە دانیشتنی١٧ی مایسی ١٩٢٧ ئەنجومەن داوای چارەسەرکردنی باری خوێندن لە ناوچە کوردییەکانو خوێندن بە زمانی کوردی دەکەن، بەلاّم ئەوەی جێی سەرنجە داود حەیدەری( ١٨٨٦-١٩٦٥) کە نوێنەرانی هەولێر بوو دژی بیروڕای هاوڕێکانی لە ئەنجومەن قسە دەکاتو لەگەلّ خوێندن بە زمانی کوردیدا نابێت لە ناوچە کوردییەکان[٨٧]، هەر بۆیە بیروڕاکانی دەبێتە جێگای ناڕەزایی هاوڕێکانی لە ئەنجومەن بە تایبەتیو خەلّکی کوردستان بە گشتی. ئەوەتە گەورە پیاوانی ڕەواندز ڕەتی قسەکانی داود حەیدەری دەکەنەوەو دەلّێن:" **لە ئەسنای موزاکەرەی میزانیەی مەعاریف دا لە عەلەیهی تەعلیمی ئاگاداری مەناقەشەکەتان لە غەزەتە خوێندرایەوە، خیرەتمان کرد ئێوە کە ئاگاداری ئیحتیاجاتی مەملەکەتو ئارەزوی میلەت نین، رجا ئەکەین بەم نەوعە جەسارەت مەنوێنن"[٨٨].**

---

(٨٦) هەمان سەرچاوە، ل ٦١٤.

(٨٧) محەمەد ئەمین زەکی، دوو تەقەللای بێ سوود، سەباحی غالب تۆژینەوە و لێکۆلینەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و پەراوێزی بۆ ڕێکخستووە، لەندەن، ١٩٨٤، ل ٤٠" نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨، چاپخانەی رەنج، سلێمانی ، ٢٠٠٢، ل ١٣٣.

(٨٨) شیاوی باسە ئەوانەی لە ڕەواندز نامەکەیان ناردووبوو بریتی بوون لە: محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی سەرۆکی شارەوانی ڕەواندز، محەمەد ئەمین سەرۆکی دەرگەلە، شێخ محەمەد سەرۆکی بالەك، مستەفا محەمەد سالح ئەفەندی ئەندامی کارگێڕ و ئەسعەد سەرۆکی زراری. نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ، ل ١٣٤.

شیاوی باسە کاتێك حکومەتی عیراقی کەوتە هەوڵی ئەوەی لە پێناوی بنیاتنانو پەرەپێدانی ئەو دەوڵەتە عەرەبییە تازەیە، کورد بەکار بهێنێ و بۆ ئەو مەبەستەش لە یەکێك لە بڕیارەکانیدا بە زۆرەملێی سەربازی دەسەپێنێ. لە بەرانبەر دا ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی بە ناوی هەموو کوردەوە لە ١٢ی تەشرینی دووەمی١٩٢٧ لە ڕۆژنامەی (Baghdad Times)دا بەرپەرچی ئەو بڕیارە دەداتەوە و دەڵێ:" ...**بەڵێ بۆ زانین ئێمەی کورد کۆکین لەگەڵ برا جەعفەریەکانمان بە تەواوی لە سەر ئەوەی کە یاسای سەربازی بە زۆرەملێ لەگەڵ باری سیاسیمان ناگونجێ، ...، وە ئێمە وای دەبینین کە یاسای بە زۆرەملێی سەربازی سوودی نییە،...، بۆیە داوا لە حکومەت دەکەین کە ئەو فکرەیە لابات لەو کاتەی ئێستادا**" [٨٩].

دووەمین خولی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی لە ١٩ی مایسی ١٩٢٨ دەستی بە کارەکانی کرد، ئەمجارەشیان ژمارەیەك نوێنەری کوردی تیادا بوو. مەعروف چیاووك کە یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێدا ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕاو کوبوونەوە نەبوو ئەو قسەی تیادا نەکاتو لە سەر کێشەی ڕەوای گەلەکەی نەیەتە وەلام. ئەوەتە لە کۆبوونەوەی ٢٦ی ئابی ١٩٢٨ کاتێك عەتا ئەلخەتیبی نوێنەری کوت باس لە مووچەی سەید تەهای نەهری قائیمقامی ڕەواندز دەکاتو چەند جارێك دووبارەی دەکاتەوە، مەعروف چیاووك لێیدێتە وەلامو دەڵێ:" **پێم وایە نوێنەری بەڕێز عەتا ئەلخەتیبی نازانێ پایەو مەقامی بلندی میری( کوردان) سەید تەهای ئەفەندی**

(٨٩) عبد الرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثاني، ص١٠٠.

چی‌یه. سەید تەها پیاوێکی گرنگ‌و ناسراوە، شوێنی تایبەتیی لەناو کورداندا هەیە، ئەگەر ئەو نەبوایە ئەو ناوچەیە ئێستا سەر بە ولاتێکی‌تر دەبوو، بێ ئەو باشووری کوردستان توشی بەزم و ڕەزم دەهات. من پێم وایە ئەگەر حکومەت سێ چوار هەزار ڕۆپییەشی بداتێ هێشتا بۆ ئەو هەر کەمە"[90]. هەروەها لە دانیشتنی١٣ی حوزەیرانی ١٩٢٩ بە توندی پرسیاری خۆی ئاراستەی وەزیری بەرگری عیراقی محەمەد ئەمین زەکی(١٨٨٠-١٩٤٨) دەکات‌و دەڵێ: "ئاگادار کراوم بە بوونی مانۆڕێکی سەربازی لە ناوچەکانی زێبارو ئامێدی. ئایا ئەمە ڕاستە؟ ئەگەر ڕاستە ئەو هۆکارانە چین کە بوونەتە هۆی هەڵبژاردنی ئەو تێچوونە زۆرە بۆ ئەو مانۆڕە لەو کاتەدا؟ ئایا ئەو مانۆڕە پەیوەندی بە نیشتەجێ کردنی ئاشوورییەکان لەو زەویانەدا هەیە کە موڵکی هۆزی بارزانی کوردیین؟"[91].

لوتکەی کاری ئەندامانی کورد لە ئەنجومەنی نوێنەران پێشکەش کردنی یاداشتێك بوو بۆ سەرۆك وەزیران عەبدولموحسن سەعدون(١٨٨٠-١٩٢٩) لە شوباتی ١٩٢٩ دا کە تیایدا هاتبوو: پارەی زیاتر تەرخان بکرێت بۆ پەرەپێدانی خوێندەواری‌و ڕۆشنبیری لە ناوچە کوردییەکاندا. هەروەها دەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتی لە ناوچە کوردییەکانی سلێمانی، هەولێر و کەرکوك پێك بهێنرێت، لەگەڵ پێك هێنانی لیوایەکی تازە لە ناوچە کوردییەکانی سەر بە لیوای

---

(٩٠) معروف جياووك، نيابتي في ١٩٢٨-١٩٣٠، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٣٧، ص ٧٥.

(٩١) بۆ زیاتر زانیاری لە مەڕ گفت‌وگۆی نێوان مەعروف چیاووك و محەمەد ئەمین زەکی بڕوانە: معروف جياووك، نفس المصدر ، ص ص ٢٠٨-٢٠٩.

مووسڵ و، کاروباری ئەو بەڕێوەبەرایەتییەش لە لایەن (پشکنەرێکی) کورد بەڕێوەببرێت و، پارەی پێویست تەرخان بکرێت بۆ بووژانەوەی ناوچە کوردییەکان. بەڵام کاتێك حکومەتی عیراق لەگەڵ کۆمیسیاری باڵای بریتانی لە سەر داواکارییەکانیان کۆدەبنەوە، ڕەتی ئەوەیان کردەوە کە بەڕێوەبەرایەتییەکی تایبەت بە ناوچە کوردییەکان دابمەزرێت لەگەڵ لیوای دهۆك دا، کەچی بۆ داواکارییەکانی‌تریان بەڵێنیان دا کەوا لە ماوەی داهاتوودا بۆ یان جێبەجێ بکەن[٩٢]. ئەوەی جێگای سەرنجە دوای پێشکەش کردنی ئەو یاداشتە خودی مەلیك فەیسەڵ بڕیار دەدات کە جارێکی‌تر نابێت ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و حازم شەمدین ئاغا[٩٣] ببن بە نوێنەر لە ئەنجومەنی نوێنەرایەتی لە عیراقدا[٩٤]. چونکی ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی هەر بەوە نەوەستاوە، بەڵکو بە تەنیاش یاداشتێکی پێشکەش بە سەرۆك وەزیران و کۆمیسیاری باڵا کردووە[٩٥]. هەروەها بیرو بۆچوونەکانیشی

---

(٩٢) عبد الرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، الجزء الثالث، مطبعة العرفان، لبنان،١٩٤٨، ص ٢٩٠؛ محمود الدرة ، القضية الكردية، الطبعة الثانية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦ ص ص ١٥٥-١٥٦.

(٩٣) حازم شەمدینان ئاغا کوڕی یوسف پاشا کوڕی شەمسەدین ئاغایە و لە ساڵی ١٨٩٥ لە زاخۆ لە دایك بووە، چەند جارێك بۆتە نوێنەری مووسڵ لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی و لە پاشان چەندین پلە و پایەی تری کارگێڕی وەرگرتووە و ڕۆڵی کاریگەری تیادا بینیوە. تا لە ١ی حوزەیرانی ١٩٥٢ لە مووسڵ کۆچی دوایی کردووە. مير بصري، اعلام الكرد، الطبعة الاولى، لندن ، ص ٢٢٢.

(٩٤) احمد خواجە ، چیم دی ، بەرگی سێیەم، چاپخانەی راپەرین، سلێمانی، ١٩٧٠، ل ٥٢.

(٩٥) عبدالفتاح علی يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص ص ٥٩-٦١.

لە شێوەی کوراسەیەك بلاوکردۆتەوە[96]. بۆیە دەتوانرێ بووترێ، کە ئیسماعیل بەگ لە سۆنگەی ئەوەی ڕۆڵێکی کاریگەری لە بابەتی نەتەوەیی‌و نیشتمانی دەبینی مایەی هەراسان کردنی دەسەلاتدارانی عیراق بوو، بە تایبەت مەلیکی عیراق( فەیسەڵی یەکەم).

زەمینە خۆشکردن بۆ بەستنی پەیماننامەیەکی نوێ لە نێوان عیراق‌و بریتانیا دەنگ‌و باسی ناو ڕۆژنامەکانی عیراقی داگرتبوو، بەلام یەکێ لەو مەسەلانەی کە سەرانی کورد بە گشتی‌و نوێنەرانی کوردی بە تایبەتی دەورووژاند ئەوە بوو ئاخۆ ڕەشنووسی ئەو پەیماننامەیە هیچ مادەیەکی تایبەت بە پاراستنی مافەکانی کوردی تیایە. بۆیە دەبینین مەعروف چیاووك لە دانیشتنی ١٣ی شوباتی ١٩٣٠ ئەنجومەنی نوێنەران ڕووی پرسیاری ئاراستەی سەرۆکی وەزیران ناجی سویدی( ١٨٨٢-١٩٤٢ ) دەکات و دەڵێ: **"تکام وایە ئەو پرسیارانە لە سەرۆکی وەزیران بکرێ، بۆ ئەوەی بەدەم لە بەردەمی ئەنجومەنی بەرزدا وەلامیان بداتەوە، ئەو بنچینەیەو ڕێو شوێنانە چین کە حکومەت دایناون بۆ گفتوگۆی ویستراو بۆ بەستنی پەیمانە تازەکە؟ ئایا هیچ بەربەستێك لە سەر ئەو مەرجانە هەیە کە کۆمەڵەی گەلان لە بابەت ناوچەکانی سەرو سەلماندوویەتی؟ ئایا حکومەت بە تەمایە لە ناوەخنی پەیماننامەکە دا جێگیری بکا؟**

---

(7)Air,23/414/5088( From S.S.O" Erbil" to staff intellgence" Hinaidi",31,3,1929.

لە: سروە صابر اسعد، المصدر السابق، ص ٥٨. وەرگیراوە.

...".[97] بەلاّم سەرۆك وەزیران پەیماننامەکە بە پەیماننامەیەکی نێو دەوڵەتی نێوزەند دەکاتو بە پێویستی نازانێ کە مەسەلە ناوخۆییەکان بخرێنە ناویەوە[98].

حکومەتی عیراقی بە مەبەستی هێور کردنەوەو کپ کردنی دەنگی کوردەکان لە نیسانی ١٩٣٠ بڕیاری ئەوەیدا کە زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لە ناوچە کوردییەکاندا(٩٩). کە ئەمەش جێگای دڵخۆشکەری کوردەکان بوو هەر بۆیە گەورە پیاوانی ڕەواندز سوپاسو پێزانینی خۆیان ئاراستەی هەر یەك لە سەرۆك وەزیران و باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بالاّ و وەزارەتی ناوخۆو جەمال بابانی( ١٨٩٣-١٩٦٦) وەزیری داد دەکەن( ١٠٠). بەلاّم کاتێك هەر دوولا پەیماننامەکە لە ٣٠ی حوزەیرانی١٩٣٠ واژۆ دەکەن بێ ئەوەی ئاماژە بە مافی کوردان بدەن، جارێکیتر نارەزایی ناوچە کوردییەکان دەگرێتەوە. لێرەشدا ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی بۆ ئەو مەبەستە لە نامەیەکیدا کە ئاراستەی کۆمیسیاری بالاّی لە عیراق کردووە دەلّێ: " فخامت مندوبی سامی عراق- بغداد بمناسبتی سفری فخامتان بو لندن بو

---

(٩٧) محاظر مجلس النواب ١٣/ شباط /١٩٣٠، ص ٣٥٦؛ معروف جیاووك، نیابتی، ص٢٣٠-٢٣١.

(٩٨) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق" سەردەمی قەلّەم و موراجەعات١٩٢٨-١٩٣١، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٥٠.

(٩٩) د. ابراهیم خلیل احمد، تطور التعلیم الوطني في العراق( ١٨٦٩-١٩٣٢)، مطبعة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٨٢، ص ٢٩٣؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق" سەردەمی قەلّەم و موراجەعات١٩٢٨-١٩٣١، ل ١٨٥.

(١٠٠) زاری کرمانجی، ژمارە( ٢٢)، ٣٠ نیسانی ١٩٣٠، ل ١١ سەرچاوەی پێشوو.

معاهدەی عراق و بریتانی من بە وکالتی کوردەکان وە تشریف ئەکەم کە فخامتان دعوت بکەم بۆ ئەمەی لە قچیهی کوردیا أگاداربن. مندوبی سابقی هەولێر اسماعیل رواندزی، ٥ تموز ٩٣٠"(١٠١).

ئیتر لە ئەنجامی ئەو نارەزاییەو بۆ مەبەستی هێورکردنەوەی رەوشەکە، وەفدێکی حکومەت کە پێك هاتبوون لە جەعفەر پاشا(١٨٨٥-١٩٣٦) وەکیلی سەرۆك وەزیران و مێجەر یونغ وەکیلی باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بریتانیو وەزیری دادی عیراقی سەردانی ناوچە کوردییەکان دەکەنو لە ٩ی ئابی ١٩٣٠ دەگەنە هەولێر. کاتێك لە هەولێر لەگەڵ گەورە پیاوانی ناوچەکە کۆدەبنەوەو، وەکیلی سەرۆك وەزیرانو وەکیلی باوەڕپێکراوی کۆمیسیاری بالاّ وتارێك پێشکەش دەکەن، ئیسماعیل بەگی رەواندزی لێیان دێتە وەلاّمو دەڵێ:" **فەخامەتی جەعفەر پاشا، ئێمە چیکە بەو قسە پڕوپوچانە فریو ناخۆین. لە سەر قەراری عوسبەت ئومەم حەقی خۆمان ئەوێو، ئەبێ بە فەوری لیوای دهۆك-مان بۆ تەشکیل بکەن. ئیمتیازی سەربەخۆیەتی-مان بۆ دیارو جیا بکەنەوە**"(١٠٢). بەلاّم ئەو وتانەی ئیسماعیل بەگ، جەعفەر پاشای وەکیلی سەرۆك وەزیرانی عیراقی تووڕە دەکات. هەر بۆیە شایەدحاڵێك لەو بارەیەوە دەڵێ:" **...جەعفەر پاشا تووڕە بوو وتی بێدەنگ بە تۆ بچووکی نازانی چیت دەوێ**"(١٠٣).

---

(١٠١) د. کوردستان موکریانی، روناکی یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری هەولێر، چاپی یەکەم، دەزگاری چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠١، ل ٢٨.

(١٠٢) احمد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل ٦٠ ؛ میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤.

(١٠٣) معروف جیاووك، ماساة بارزان المظلومة، ص ٨٤.

ئینجا لە پاشان کە مەعروف چیاووك دێتە وەڵامو وەکو یاسا ناسێك ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە حکومەت بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانی جێبەجێ نەکردووە، هەر بۆیە بە پێویستی دەزانێ کە بڕگەیەکی تایبەت بە پاراستنی مافی کوردان بخرێتە ناو پەیمانەکەوە[١٠٤].

جێگای ئاماژە بۆ کردنە لێرەوە لە سەرچاوە مێژووییەکان شتێکی ئەو تۆ بەدی ناکرێت کە پەیوەندی بە ڕۆڵو چالاکی ڕەواندزییەکانەوە بێت لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقیدا، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە یەکێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەندامییەتی ئەمین پاشا ڕەواندزی دەکات کە لە ساڵی ١٩٣٥ ئەندام بووە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا[١٠٥].

هەروەها ئەحمەدی محەمەدی عەلی ئاغای جوندیانی[١٠٦] لە

---

(١٠٤) احمد خواجه، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل ٦٣.

(١٠٥) ئەمین پاشا ڕەواندزی، لە ساڵی ١٨٦٥ لە ڕەواندز لە دایك بووە و لە قوتابخانەی سەربازی عوسمانی و قوتابخانەی ئەرکانی جەنگی خوێندویەتی. دواتر پەیوەندی بە سوپای عوسمانی کردووە و تا پلەی لیوای وەرگرتووە و بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کردووە، ناوبراو لە دوای جەنگ گەڕاوەتەوە بەغدا و لە ١٩٣٥ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران و لە دواتریش سەرۆکی لێژنەی کاروباری سەربازی بووە تا لە ساڵی ١٩٤١ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. میر بصری، المصدر السابق، ص ٧٢.

(١٠٦) ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ساڵی ١٩٢٢ لە ڕەواندز لە دایك بووە و بە ئەحمەد دیاب ناسراوە، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لە ڕەواندز تەواو کردووە، دواتریش بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنی هاتۆتە هەولێرو لەگەڵ قوتابییەکانی شاری کۆیە چالاکی زۆریان نواندووە لە لێدانی بڵاوکراوە لە دیوارەکانی شاری هەولێر لە دژی کارو کردەوەکانی حکومەت کە لە ئەنجامدا شەوێکیان کەوتوونەتە بەر ڕێژنەی گوللەی حەس حەسەکان. هەروەها لە دواتریش چۆتە ڕیزی پارتی هیوا و بەشداری لە شۆڕشی (١٩٤٣- ١٩٤٥)ی بارزان کردووە لەگەڵ شۆڕشی ئەیلول. ناوبراو ئێستاکەش لە ژیان ماوە و لە هەولێر لە گەڕەکی

دیمانەیەکدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە باوکی بە هۆی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ بەکر سدقی لە دوای کودەتای ساڵی ١٩٣٦ و دامەزراندنی حکومەتی حیکمەت سلێمان دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و ئەو ماوەیە لە بەغدا دەمێنێتەوە[١٠٧]. لە لایەکی دیکەشەوە سەرچاوەیەکیتر لە بارەی باس کردنی شێخ محەمەد ئاغای باڵەك دا دەڵێ: "... **لە وانەیە ئێستا(١٩٣٨) پایەو دەسەڵاتی لە هەڵکشاندا بێ، چونکە بەو دواییە بە ئەندامی پەرلەمان دامەزراوەو بە ڕێك و پێکی لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی یاسادانان ئامادە دەبێ لە بەغدا...**"[١٠٨].

ئەنجام دەتوانرێ بووترێ، کە بێ دەنگی ناو کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی نوێنەران لە دوای ساڵی ١٩٣٢ دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەندامی کاراو چالاکی کورد لەو ئەنجومەنەدا، چونکێ زۆربەی ئەوانەی دەبوونە ئەندام تەنیا خەریکی پاراستنی مافەکانی خۆیان بوون.

---

برایەتی نیشتەجێیە. دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

(١٠٧) دیمانەیەك لەگەڵ ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی لە ١٢ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ هەولێر.

(١٠٨) ئی. ئار. ئیچ، ڕەوشی ئابووری و کۆمەلایەتیی کوردی ڕەواندز، وەرگێڕانی: د. عەزیز گەردی، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٤٧.

# تەوەری یەکەم

## رۆڵ و چالاکیی ڕەواندزییەکان لە کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی سەردەمی داگیرکاریی بریتانی( ١٩١٨-١٩٣٢ )

چالاکی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان بەشێکی گرنگ لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان دەگرێتەوە، کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی پێی نایە قۆناغێکی نوێوەو، ژمارەیەك پارتو کۆمەڵەو ڕێکخراو هاتنە مەیدانەوە. جا بۆ ئەوەی ڕۆڵو چالاکییەکانی ڕەواندز لەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە دیار بخەین یەکەیەکە ڕیزبەندیان دەکەینو باسیان لێوە دەکەین.

- کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان:

دوای بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی کوردە نیشتەجێبووەکانی ئەستەمبۆل کەوتنەوەخۆو( کۆمەڵەی بەرزێتی کوردستان)یان دامەزراند، کە پێك هاتبوون: لە سەید عەبدولقادری شەمزینی سەرۆك، ئەمین عالی بەدرخان جێگر، حەمدی پاشا ئەمینداری گشتی، سەید عەبدوڵڵا کوڕی سەید عەبدولقادر بەرپرسی دارایی و ژمارەیەك ئەندامانی تر[١]. ئەو کۆمەڵەیە چالاکییەکی زۆری نواند لەو

---

(١) د. بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد مێژینە و ئێستای کورد، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، چاپی سێیەم، کوردستانی عێراق، ١٩٩١، ل ٥٢؛ زنار سلوپی، في سبيل كردستان( مذكرات)، ترجمة: ر. علي، طبعة الاولى، رابطة كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٨٧،ص ٦١. تێبینی: تاکە سەرچاوە کە باس لە ئەندامیەتی ئەمین پاشا ڕەواندزی بکات. أبى العلاء، لمحات عن الجمعيات الكردية في العهد العثماني و

سەردەمەدا بە مەبەستی هێنانەدی مافەڕەواکانی نەتەوەی کورد، هەر بۆیە پەیوەندییان کرد بە باڵیۆزخانەی دەوڵەتە زلهێزەکانی وەکو بریتانیا، فەرەنساو ئەمەریکا تا لە ڕێگای ئەوانەوە مافەکانیان دەستەبەر بکەن[٢]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە هەڵسان بە ڕەوانەکردنی ژمارەیەك لە ئەندامانیان لە ٢٥ی مارتی ١٩١٩ بە سەرۆکایەتی خلوسی بەگ[٣] لە ڕێگای (مووسڵ)ەوە بۆ سلێمانی تا نامە ئاراستەی هۆزە کوردییەکان بکەن و هانیان بدەن بۆ یەکخستنی هەوڵو کۆششەکانیان لە پێناو هێنانەدی سەربەستیو سەربەخۆیی[٤].

---

اثر الحرب الإمبريالية العالمية الاولى، القسم الثاني، جريدة التآخي، العدد (١٠١)، ١٠/آب/١٩٦٧، ص ٧.

(٢) د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا، وەرگێڕانی: موحەمەد نوری تۆفیق، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٢١٣؛ جليلى جليل و الأخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: د.عبدي حاجي، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٢، ص ص ١٠٣-١٠٤؛ سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩٢٦ دراسة تاريخية سياسية وثائقية، الطبعة الأولى، وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص ص ١٧٥-١٧٦.

(٣) خلوسی بەگی تەمەن ٤٥ ساڵ دەوڵەمەندێکی خەڵکی ڕەواندز بوو و لە ژنەوەش خزمایەتیی لەگەڵ بەدرخانییەکان هەبوو. ناوبراو لەگەڵ سەعید بەگی سەرۆکی لیژنەی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی دا ناکۆك بوو، هەر بۆیە ساڵانێك بوو ئاوارەی ئەستەمبۆل کرابوو، دەشیێ بە نەمانی ئیتیحاد و تەرەقییەکان هەوڵی دابێ سوود وەربگرێت و دەسەڵاتی جارانی بۆ بگەڕێتەوە و بەم نیازەش سەرکردایەتی ئەو نێردراوانەی کردبێ. د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، کورد و کوردستان لە کۆمەڵە وتارێکی مێژووییدا، وەرگێڕانی: ئازاد عوبێد، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ل ٩٣-٩٤؛ کۆمەڵێك لە پسپۆڕان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.

(٤) هەمان دووسەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

- کۆمەڵەی نهێنی کوردی( الجمعیه السریه الکوردیه):

تاکە سەرچاوە کە باس لەو کۆمەڵەیە بکات عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی‌یە کە لە پەرتووکی (الحیاه الحزبیه فی الموصل) دەڵێ:" **یەکێك لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی کە دامەزرا بەر لە لکاندنی باشووری کوردستان بە عیراق لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥، کۆمەڵەی نهێنی کوردی بوو کە دژی هەوڵەکانی بریتانی وەستا بۆ بەستانەوەی باشووری کوردستان بە هێز بە عیراقەوە، کە بنکەی چالاکییەکانی لە سلێمانی‌و ڕەواندز بووو، ئەحمەد تەقی‌و کەریم فەتاح هەمەوەندی‌و نووری باویل ئاغا لە ئەندامە دیارەکانی بوون**" [٥].

- کۆمەڵەی هۆگر:

سەبارەت بە کۆمەڵەی هۆگر زانیاری ئەوتۆ لە بەردەست دانی‌یە تەنیا ئەوەندە نەبێت کە کریس کۆچێرا دەڵێ:" **تەها لە ڕەواندز دا هەوڵ دەدات ئەنجومەنێکی ئەدەبی((هۆگر)) (Hogir ) بە مەبەستی پەرەپێدانی زمانی کوردی‌و ئاشنا بوون بە مێژوو و ڕیشەی کورد دابمەزرێنی، بەلاّم لایەنی سیاسی نەخشەکەی هەر لە سەرەتاوە هێندە زاڵ دەبێت کە دەوڵەت ڕێگەی نادات**"[٦]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە فەیسەڵ دەباغ بە زیادە لە سەر قسەکانی ئەوو بێ ئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوەیە بکات کە زانیاریەکەی لێ وەرگرتووە دەڵێ:" **بە پێی زانیاری من ناوی ئەو کۆمەڵەیە( هۆگری) بوو و، لە ساڵی**

---

(٥) د.عبدالفتاح علی البوتاني، الحیاة الحزبیة في الموصل١٩٢٦-١٩٥٨، مطبعة وزارة التربیة، اربیل، ٢٠٠٣، ص٣٠١.

(٦) کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦.

**١٩٢٥ دامەزرا بوو، بە ئامانجی بلاّوکردنەوەی زمانی کوردی و ئاشنا بوون بە مێژووی کوردی و تایبەتمەندییەکانی نەتەوەی کورد، بەلاّم ئەو کۆمەڵە لە دواتر شێوەیەکی سیاسیی بە خۆیەوە دی و لە لایەن حکومەتەوە هەر ئەو ساڵە داخرا"[٧].**

کەواتە لێرەدا جۆرە جیاوازیەك بەدی دەکرێت ئەویش نەك تەنیا لە ناوی کۆمەڵەکەدا کە هەر یەکەیان بە شێوەیەك باسی لێوە دەکەن، بەڵکو لە سەر هاتنە دامەزراندنیشی کۆك نین یەکێکیان دەڵێت: لە سەرەتاوە رێگەی دامەزراندنی نەدراوەو، ئەوەی تریان دەڵێت: دامەزرا بەلاّم بە خەریك بوونی بە کاری سیاسیی لە دواتر لە لایەن حکومەتەوە داخراوە.

- کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان( پارتی ئازادی):

کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان( جڤاتا خووە سەریا کورد) کە بە پارتی( ئازاد)یش ناسراوە، بە دەست پێشخەری میر ئالاّ( کۆلۆنیل) خالید بەگی جبرانلی- سەرەك هۆزی جبرانلی- لە ئەرزەرۆم لە ساڵی ١٩٢١ بە شێوەیەکی نهێنی دامەزرا[٨]. دەستەی دامەزرێنەرانی ئەو

---

(٧) فیصل الدباغ، اضواء علی کتاب الجمعیات و المنظمات و الاحزاب الکوردیة في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، الطبعة الاولی، مطبعة الثقافة، اربیل، ١٩٩٧، ص ٦٠.

(٨) بە شێوەیەکی سەرەکیی و یەکڕای تاوەکو ئێستا مێژووی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە یەکلایی نەبۆتەوە، لە بەر ئەوەی ئەوانەی دەربارەی ئەو کۆمەڵەیان نووسیوە هەر یەکە و بەپێی بیرەوەری و بۆچوونی خۆی ساڵێکی بۆ مێژوویی دامەزراندنی داناوە. لە وانە نووری دەرسیمی پێوایە ساڵی ١٩٢٢ دامەزراوە، زنار سلوپی بە ١٩٢٣ی لەقەڵەم ئەدا، ژمارەیەکی تریش وەکو ئیسماعیل حەققی شاوەیس، ئیحسان نووری بەدلیسی، تۆفیق ماردینیو ئەحمەد ڕاسم ساڵی ١٩٢١ی بۆ دادەنێن.
N uri Dersimi,Kurdistan Tarihinde Dersim, Halap,1925,P173;

کۆمەڵەیە لە یوسف زیاو ، ئیسماعیل حەققی شاوەیس، سەرهەنگ ئیحسان نووری پاشا، مولازم راسم شکاك، ڕەشید وانلی و چەندانی تر پێك هاتبوون[٩]. کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان یەکەمین کۆمەڵەی سیاسیی کوردی بوو کە بە شێوەیەکی تەواو هاتە دامەزراندن لە ڕووی ڕێکخستنی سیاسیی و دەرخستنی ئامانجەکانی، هەر بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا توانی ژمارەیەکی زۆر لە نیشتمانپەروەران لە دەورەی خۆی کۆبکاتەوە و چەندین لقیش لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستان بکاتەوە[١٠].

لقی مووسڵی کۆمەڵەی ئیستیقلالی کوردستان دوای سەرنەکەوتنی کوردەکانی باکووری کوردستان لە شۆڕشی ١٩٢٥و بەو دەسەڵاتەی کە کۆمەڵە بە شێخ مەهدی دابوو هاتە دامەزراندن کە دەستەی بەڕێوەبردنی ئەو لقە لە ٢٦ی تەمموزی ١٩٢٦ لە یانزە کەس پێك هاتبوون‌و زۆربەشیان لە پلەو پایەی سەربازی‌و میری دابوون وەکو: موقەدەم عەبدولوەهاب ئەفەندی، مولازم ئەمین ڕەواندزی، مولازم حوسێن ئەفەندی ڕەواندزی، مەعروف چیاووك دادوەری تاوانەکان لە

---

زنار سلوپی، المصدر السابق، ص ١٠٤؛ ئیسماعیل حەققی شاوەیس، کۆمیتەی ئیستیقلالی کوردستان، گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژمارە( ١) ، سلێمانی، ساڵی دووەم، ئایاری ١٩٦١، ل٢٠؛ ڕۆبەت ئۆلسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٧٢-٧٣.

(٩) د. احمد عثمان ابوبکر، اسماء الاعضاء البارزین لحزب( ئازادي) في کردستان الشمالية عام ١٩٢٤، جريدة خەبات، العدد( ٧٣٩) ، اربيل، ٢٤/اب/ ١٩٩٤؛ فيصل الدباغ، اضواء على...، ص ص ٥٣-٥٤.

(١٠) د. عبدالفتاح علی يحيی البوتاني، وثائق عن الحركة الكوردية...، ص ٤٨٨ وما بعدها.

مووسڵو چەندانی تر[11]. بەڕێوەبەری لقی مووسڵی کۆمەڵەکە ئەمین ڕەواندزی بوو کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە سەرۆکی کۆمەڵەکەوە هەبووەو، چەندین جاریش سەرۆکی کۆمەڵە نامەی لەگەڵدا گۆڕیوەتەوەو سەردانی کردووە، تەنانەت لقەکە وەکو نێوەندێك بووە لە نێوان لقەکانی دیکەدا[12].

دەسەلاتدارانی بریتانیا لە چالاکییەکانی لقی مووسڵی کۆمەڵەی ئیستیقلال بێ ئاگا نەبوون، بەڵکو بەردەوام چاودێرییان کردووەو ئاگاداری کارەکانیان بوون، لە بەر ئەوەی بەرپرسی هێزی ئاسمانی بریتانی ئەو لقەی بە چالاکترین لقی کۆمەڵەی ئیستیقلال لە قەڵەم داوە[13]. هەروەها هەر لە ڕێگای چاودێرکردنیان توانیویانە دەقی ئەو نامانەیان دەست کەوێت کە لە نێوان لقی مووسڵ و سەرۆکی کۆمەڵە ئاڵوگۆڕ کراوە[14]. ئیتر لە سەر ئەنجامی ئەوانە حکومەت کەوتە پەراگەندە کردنو بەندکردنی زۆر لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەو جیاکردنەوەیان لە یەکتری، ئەگەرچی ئەوانەی کە مانەوە بەردەوام بوون لە کارەکانیان تا دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبوون لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٧[15].

---

(١١) طارق جامباز، وثائق غير منشورة امين الرواندوزي و معروف جياووك و دورهما في جمعية استقلال كوردستان ١٩٢٢-١٩٢٦، مجلة گولان العربي، العدد (٦)، ٢٥/١١/١٩٩٦،ص ٢٥-٣٠؛ طارق جامباز، خمس وثائق غير منشورة، مجلة گولان العربي، العدد (١٠) ٢٥/ئازار/١٩٩٧، ص ٨١-٨٣.

(١٢) د.عبدالفتاح على يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة الكوردية...، ص ٤٨٨وما بعدها.

(١٣) طارق جامباز، وثائق غير منشورة امين الرواندوزي و معروف جياووك...، ص ص ٢٦-٢٧.

(١٤) نفس المصدر، ص ص ٢٥-٣٠.

(١٥) د. عبدالفتاح على البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل، ص ٣١١.

- کۆمەڵەی پشتیوان:

ئەو کۆمەڵەیە کە بە( کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان)یش ناودەبرا[16] لە سەر دەستی ژمارەیەك نیشتمانپەروەری کورد لە شاری بەغدا بە شێوەیەکی نهێنی لە١٠ی تەمووزی ١٩٢٧ دامەزرا کە دەستەی سەرۆکایەتی ئەو کۆمەڵەیە پێك هاتبوون لە ئەفسەرو پلەدارو فەرمانبەرانی میری لە وانە: مستەفا شەوقی سەرۆك، ڕەشید نەجیب سکرتێری یەکەم، ئەحمەد خواجە سکرتێری دووەم، خەلەف شەوقی، ئەمین ڕەواندزیو چەندانی تر[17]. کۆمەڵەی پشتیوان ماوەیەکی زۆری نەبرد چەندین لقی لە شارە جیاجیاکان دا کردەوە، بەڵام لقی(مووسڵ)ی لە هەموویان چالاکتربوو[18].

---

(١٦) زۆر جاران مێژوو نووسان و لێکۆڵەرەکان جیاوازی ناکەن لە نێوان کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان و کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زانیارییەکانیان لە بەڵگەنامە بریتانییەکان وەرگرتووە ئەوانیش ئەوەندە جیاوازی نێوان ئەو وشە کوردیانەیان نەکردووە و هەرجارە بە شێوەیەك ناویان بردون. سەبارەت بەو دوو کۆمەڵەیە زانیاری تەواو ئەوەیە کە ئەوەی یەکەمیان واتە کۆمەڵەی پشتیوانی کوردان لە شاری بەغدا ساڵی ١٩٢٧ دامەزراوە و لقی لە زۆربەی شارەکان هەبووە و تا ساڵی ١٩٣٠ بەردەوام بووە ، بەلاّم کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان هەر تەنیا لە شاری مووسڵ ساڵی١٩٣٠ دامەزراوە کە دواتر باس لە چالاکییەکانی دەکەین. احمد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل ٣٠؛ کەمال مەزهەر، مامۆستا بەشیر لە بەڵگەنامەیەکی نهێنی بەریتانیای گەورەدا، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە( ٢٧) ، ساڵی ١٩٩٠، ل ل ٢٦-٢٧؛ د. کمال مظهر احمد، الاستاذ اسماعیل حقی شاوەیس یروي صفحات من نضال الشعب الكردي، جريدة التآخي، العدد( ١٤٦٢)، ١٥ تشرين الاول ١٩٧٣، ص ٧.

(١٧) احمد خواجە، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل ٣٠.

(١٨) هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم، ل ٣٠" ك. پ.ك، پەیامی مانگی ٣٠/٦/١٩٣٠ دەست نووس( لە ئەرشیفخانەی بنەماڵەی موکریانی پارێزراوە و بۆ یەکەمین جارە بلاّودەکرێتەوە).

جێگای ئاماژە بۆ کردنە یەکێك لە چالاکییەکانی ئەو کۆمەڵەیە بلاۆکردنەوەی بەیاننامەیەك بوو لە تەمموزی ١٩٣٠ بە سەر ماڵە کوردەکانی بەغداو لقەکانی‌تریدا کە تیایدا داوای لە کوردەکان کردبوو بەشداریی هەڵبژاردنی پەرلەمانی نوێی عیراق نەکەن، لە بەر ئەوەی ناتوانن دان بە ڕژێمێك دابنێن کە دان بە مافەکانیان دا نەنێت، هەروەها لەگەڵ ئەوەش هانی دابوون بۆ یەکێتی‌و تەبایی‌ی ڕیزەکانیان(١٩).

- <u>کۆمەڵەی خۆیبوون:</u>

دوای سەرنەکەوتن‌و سەرکوت کردنی شۆڕشی ١٩٢٥ لە باکووری کوردستان دا ژمارەیەکی زۆر لە نیشتمانپەروەرانی کورد پەرِاگەندەی ناوچەکانی عیراق، سوریا، ئێران‌و ئەوروپا بوون(٢٠). بەلاّم ئەوە نەبوو بە هۆی ئەوەی لە کارەکانیان ساردبنەوەو دەستە وەستان بوەستن. بەڵکو ئەمجارەیان بە گرِوتینێکی‌ترو بە شێویەکی تۆکمەتر لە جاران هاتنەوە مەیدان‌و لە کۆنگرەیەکی فراواندا لە هاوینە هەواری( بحەمدون) لە تەشرینی یەکەمی١٩٢٧ کۆمەڵەی(خۆیبوون)یان هێنایە دامەزراندن(٢١).

---

(١٩) ك. پ. ك، بۆ دۆست ودوژمنـــان، ١/٧/١٩٣٠، ( لـە ئارشـیفخانەی بنەماڵـەی موکریانی پارێزراوە و بۆ یەکەمین جارە بلاّودەکرێتەوە) بڕوانە پاشکۆی ژمـارە( ٥ ) ؛ کەمال مەزهەر، مامۆستا بەشیر لە بەڵگەنامەیەکی نهێنی بەریتانیای گەورەدا، ل ل ٢٦-٢٧.

(٢٠) بلەچ شێرکۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

(٢١) د.عبدالستار طاهر شریف، الجمعیات و المنظمـات و الاحـزاب الکردیـة في نصـف قرن١٩٠٨-١٩٥٨، الطبعة الاولی، بغـداد، ١٩٨٩، ص ٦٤. سـەبارەت بـە شـوێنی

به دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبوون سەرجەم کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی دیکە خۆیان هەڵوەشاندەوەو هاتنە ڕیزی ئەو کۆمەڵەوە کە هەر لە سەرەتاوە بەرنامەیەکی تۆکمەو ڕێكوپێکی بۆ خۆی داڕشتبوو[٢٢]، کە هەر ئەمەش بوو ڕێگای لە بەردەمی خۆش کرد لە ماوەیەکی کەمدا بتوانێ چەندین لقو بارەگای لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان بکاتەوە[٢٣]. یەکێکیش لە لقەکانی لقی مووسڵ بوو کە ئەمین ڕەواندزی سەرۆكو مەعروف چیاووك جێگری بوو[٢٤]. هەروەها لقی سلێمانی کە مستەفا زەکی صائیب[٢٥] سەرۆکایەتیی دەکرد هەر

---

کۆنگرەی دامەزراندنی کۆمەڵەی خۆیبوون بیروڕای جیاواز لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەیە. بلەچ شێرکۆ ئاماژە بۆ ناوچە کوردییەکانی باکووری کوردستان دەکات و، محەمەد عەلی عەونی دەڵێت یەکەمین کۆنگرەی نیشتمانی ساڵی ١٩٢٧ لە پاریس بوو. دوکتۆر (یەشار قلافت)یش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە یەکەمین کۆبوونەوە لە ڕەواندز بووە. بلەچ شێرکۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩؛ محسن محمد المتولي، كرد العراق منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤-حتى سقوط الملكية في العراق١٩٥٨،الطبعة الاولى، بيروت،٢٠٠١،ص١٥٨؛ د. يشار قلافت، ثورة الشيخ سعيد، انقرة، ١٩٩٢، ص١٣٤. لە: روهات الاكوم، خويبون و ثورة اگرى، ترجمة: شكور مصطفى، الطبعة الاولى، رابطة كاوا للثقافة الكردية، مطبعة اوفسيت هەولێر ،١٩٩٩، ص١٣. وەرگیراوە.

(٢٢) د. عبد الستار طاهر شريف، المصدر السابق، ص ٦٥ و مابعدها.

(٢٣) زنار سلوپی، المصدر السابق، ص ١٣١؛ روهات ئالاکۆم، المصدر السابق، ص ١٤ ومابعدها

(٢٤) دائرة السجلات العامة، وزارة الطيران، ٢٣/١٢/٤١٢ / القسم الثاني، الموصل، رقم ٢٣/٣٠٧، و المؤرخ في اليوم الرابع من تشرين الثاني ١٩٢٧، المضوع الاستخبارات الكردية، ص ٣. لە: د. ئیسماعیل شوکر ڕەسول، ڕۆڵی ڕامیاری و ڕۆشنبیری مەعروف چیاووك...، ل١١. وەرگیراوە.

(٢٥) مستەفا سائیب خاوەنی چیرۆکی لە خەوما و باوکی هونەرمەند شەماڵ سائیب و دبلۆماسێکی ناسراو بوو. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ل ٢٩٢.

یەك لە سلێمان بەگی سیلاحشۆڕ (١٨٧٥-١٩٣٦) و عوسمان بەگ کە خەڵکی ڕەواندز بوون ئەندامی ئەو لقە بوون[٢٦].

شیاوی باسە لە ڕاپۆرتێکی بریتانیدا هاتووە کە دوکتۆر شوکری محەمەد سەگبان پەیوەندی کردووە بە هەریەك لە ئیبراهیم حەیدەری، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی، حازم شەمدین ئاغا، محەمەد ئەمین زەکی و شێخ ڕەزای کوڕی شێخ سەعیدی پیران کە داوای ئەوەی لێکردووە ببن بە ئەندام لە خۆیبوون داو، ڕاپۆرتەکەش دەڵێت تارادەیەك لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بوو[٢٧].

لێرەدا هەر چەندە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ لقی کۆمەڵەی خۆیبوون ناکەن لە ڕەواندزدا، بەلاّم بە دووری نازانین کە لقی ئەو کۆمەڵەیە لە ڕەواندز دا کرابێتەوە، لە بەر ئەوەی کاتێك کۆمەڵەی خۆیبوون لەگەڵ پارتی تاشناقی ئەرمەنی ڕێکەوت و پاپازیان[٢٨] سەردانی عیراقی کرد، جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە پەیوەندی بە سەید تەهای نەهری قائیمقامی ڕەواندزەوە بکرێت، چونکیّ خاوەن نفوز و دەسەلاّتێکی زۆرە لە ناوچەکەداو لە توانایدا هەیە پیاو و چەکداری زۆر کۆبکاتەوە لە کاتی پێویستدا[٢٩]. ئەوە لە لایەك، لە لایەکیتریش لە ڕاپۆرتێکی بریتانیدا هاتووە کە سەید تەها و ژمارەیەك لە گەورە

---

(٢٦) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢٩٦.

(6) Air , 23, 413/5088) ,Advance exract to the Iraq…), 19, May,1928.

لە: سروە اسعد صابر، کوردستان الجنوبیة ١٩٢٦-١٩٣٩، ص ٢٥٤. وەرگیراوە.

(٢٨) واهین پاپا زیان ئەندامی دێرینی پەرلەمانی تورکی بور لە ویلایەتی وان و ئەندامێکی کارای پارتی تاشناقی ئەرمەنی بوو . د. ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٧.

(٢٩) هەمان سەرچاوە، ل ١٧٨.

پیاوانی کورد لەسەر سنوور هاوکاری و هەماهەنگیان بۆ شۆڕشگێڕانی کورد لە ئارارات ڕەوانە کردووە[30]. ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە کەمال مەزهەر دەڵێ:" **پێم وایە حوسین حوزنی موکریانیش کە ئەو ڕۆژگارە لە ڕەواندز بە دەرکردنی (زاری کرمانجی)یەوە خەریك بوو لە نزیکەوە پەیوەندیی بەڕابەرانی( خۆیبوونەوە) هەبووە**"[31]. واتە ئەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن دەمان هێنێتە سەر ئەو ڕایەی بڵێین ڕەنگە کە لقی کۆمەڵەی خۆیبوون لە ڕەواندزیش هەبووبێت، چونکێ سەید تەها و حوسێن حوزنی موکریانی لەو سەردەمەدا لە ڕەواندز ڕۆڵی کاریگەریان بینیوە و کاریگەریی زۆریان بە سەر خەڵکی ناوچەکەدا هەبووە.

- <u>کۆمەڵەی ئازادیی کوردستان:</u>

ئەو کۆمەڵەیە لە کۆتایی بیستەکان دامەزرا لە لایەن ژمارەیەك نیشتمانپەروەردا کە ئەندامەکانی پێك هاتبوون لە: جەمال بابان(١٨٩٣-١٩٦٦)، محەمەد ئاغای عەبدوررەحمان ئاغای سلێمانی، محەمەد بەگی جاف(١٩٠٣-١٩٣٤)، شێخ جەمال تاڵەبانی، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی، حوسێن حوزنی موکریانی، مەعروف چیاووك، عارف چیاووك[32]، حازم شەمدین ئاغای زاخۆیی و

---

(٣٠) د.عثمان علی، المصدر السابق، ص ٥٢٧.

(٣١) کمال مەزهەر، حوزنی موکریانی و ڕۆژنامەنووس و زاراوە میژووییەکان، گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی، ژمارە( ٩)، هاوینی٢٠٠٢، ل ١٩١.

(٣٢) عارف چیاووك، زانیاریم دەربارەی ئەو پیاوە دەست نەکەوت، بەلاّم ڕەنگە لە بنەماڵەی مەعروف چیاووك بێت.

چەندانیتر[٣٣]. بەلاّم بە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە کارمەندی میری بوونو ژمارەیەکیشیان کۆچی دواییان کرد، بۆیە نەیتوانی درێژە بە کارەکانی خۆی بدات و زۆری نەخایەند کۆمەڵەکە تێك چوو[٣٤].

- کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان:

لە ساڵی ١٩٣٠ لە مووسڵ بە شێوەیەکی نهێنی لە سەر دەستی دەستەیەك نەتەوە پەروەرانی کورد هاتە دامەزراندن کە ئامانجی یەکخستنی نیشتمانپەروەران بوو بۆ مەبەستی بە دەست هێنانی مافەرەواکانی کورد. ئەندامەکانی لە مەحموود جەودەت، فائق کاکەمین، محەمەد عەلی، ئەمین ڕەواندزی و چەندانی تر پێك هاتبوون[٣٥].

---

(٣٣) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆلینەوەی: حەسەن جاف، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٥، ل ل١٠٥-١٠٦؛ د. مکرم الطالباني، حزب هیوا، مطبعة خاك ، سليمانية، ٢٠٠٢، ص٤٢.
(٣٤) کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٦.
(٣٥) د. کمال مظهر احمد، الاستاذ اسماعيل حقي شاويس يروي صفحات من نضال الشعب الكردي، ص ٧.
وەکو لە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد لە لایەن نووسەر و مێژوونووسان جیاوازی لە نێوان کۆمەڵەی پشتیوان و کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان دا ناکرێت. هەر بۆیە لێرە تاهیر حەوێزی لە مێژووی کۆیە ئاماژە بۆ کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان دەکات بە ناوی کۆمەڵەی پشتیوان( سەروبەر) و دەڵێت: لە ساڵی ١٩٣١ لە مووسڵ دامەزرا و دەستەی دامەزرێنەرانی لە مەحمود جەودەت، مستەفا چیچۆ، حەمید دەبونی و ڕەشید ئەفەندی مەئموری ئیستهلاکی هەریر پێك هاتبوون. طاهر احمد حەوێزی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣.

ئەو کۆمەڵەیە توانی پەیوەندی دابمەزرێنێ لەگەڵ ژمارەیەك لەپیاوە ناودارەکانی‌تری کورد لە شارەکانی‌تر وەکو: ڕەفیق حلمی، ئەحمەد خواجەو ئەحمەد فەخری، بە مەبەستی کردنەوەی لقی تری ئەو کۆمەڵەیە لە هەموو ناوچەکانی‌تری باشووری کوردستاندا[٣٦]. بەلاّم بە هۆی ئاشکرا بوونی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە لەلایەن دەسەلاّتدارانی حکومەت‌و ئینگلیزەکان بووە هۆی پەڕاگەندە کردن و دوورخستنەوەیان لە یەکتری. بۆ نموونە مستەفا سائیب گواسترایەوە بۆ ناوچەکانی ڕەواندز، بەلاّم بە هۆی ئەنجامدانی کاری ڕێکخراوەی لە نێوان گەورە پیاوەکانی ڕایەت، باڵەك، هەریرو باتاس جارێکی‌تر دوورخرایەوە بۆ مووسڵ[٣٧]. ئیتر لە دوای تەمەنی ساڵ‌و نیوێك بە هۆی لە یەك دابڕانی ئەندامەکانی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان لە کارەکانی کەوت[٣٨].

- کۆمەڵەی یاریدەدەران( یاریدەدەر):

کۆمەڵەی یاریدەدەران لە سەر دەستی ژمارەیەك قوتابیانی کورد پەروەری شاری هەولێر لە ١٨ی مایسی ١٩٣١ دامەزراو زۆر لە کوڕە ئاغاو کاربەدەستانی ئەو شارەی لە خۆ گرتووەو لە لایەن جەلال نووری یەوە سەرکردایەتی کراوە. ئەو کۆمەڵەیە ئامانجی بلاّوکردنەوەی بیری

---

(٣٦) د. كمال مظهر احمد، الاستاذ اسماعيل حقی شاوەیس یروي صفحات من نضال الشعب الكردي، ص ٧.

(٣٧) صديق صالح، کامیل حسن لاپەڕەیەکی ون، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە( ٨) حوزەیرانی ١٩٩٩، ص٧٦.

(٣٨) د. كمال مظهر احمد، الاستاذ اسماعيل حقی شاوەیس یروي صفحات من نضال الشعب الكردي، ص ٧.

کوردایەتی‌و پێشخستنی زمانی کوردی بووە[39] . ئەوەتا کاتێك یەکێك لە گەورە بەرپرسانی حکومەتی عیراقی سەردانی ئەو شارەی کردووە ئەو کۆمەڵەیە یاداشتێکیان نوسیوەو پێشکەشیان کردووە، کە تیایدا داوای چاکردنی باری ناوچە کوردییەکانی کردووە و نارەزایی خۆیان بەرانبەر بە کاربەدەستانی حکومەت دەربڕیوە، بەلاّم دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە ئەرکی پێشکەش کردنی ئەو یاداشتە عەبدولوەهاب محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی[40] لە ئەستۆی گرتووە، ئەگەرچی ناوبراو نارەحەتی زۆری بینیوە لە کاتی پێشکەش کردنی یاداشتەکە بە هۆی بەشدار بوونی باوکییەوە لەو دانیشتنە[41].

---

(٣٩) شاکر فەتاح ، ئاوێنەی ژینم یاداشتەکانی شاکر فەتاح، ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٣١.

(٤٠) عەبدولوەهاب محەمەد عەلی ئاغا جوندیانی، ناسراو بە کاك وەهاب لە ساڵی ١٩١٢ لە کاولۆکان لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی لە ڕەواندز تەواوکردووە و بۆ درێژەدانیش بە خوێندن هاتۆتە هەولێر. شارەزایی لە زمانی عەرەبی‌و فارسی و تارادەیەك ئینگلیزی و تورکی عوسمانلی هەبووە. ناوبراو بەشداری لە پارتی هیوا، شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥) بارزان و کۆماری کوردستان دا کردووە، دوای گەڕانەوەشی بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٤٨ لە سەر سنوور بەندکراوە فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە، بەلاّم دواتر بۆی گۆڕاوە بە بەندی هەتا هەتایی و تا ساڵی ١٩٥٣ لە بەندیخانە ماوەتەوە و لە پاش بەر بوونی و سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلول بەشداری ئەو شۆڕشەی کردووە و هاوڕێ‌و نزیکی مستەفا بارزانی بووە و چالاکی زۆری نواندووە تا لە ٦ی شوباتی ١٩٧٢کۆچی دوایی کردووە. هەڵگورد عەبدولوەهاب، وەهاب ئاغای رواندزی ئەستێرەیەکی لە بیرکراوی ڕێگای رزگای کوردستان، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(٣٥٩٠) ، ٢٠٠٥/٢/٧، ل ٩.

(٤١) ئازاد جوندیانی باسی ئەو هاتنەی لە باوکی‌یەوە گوێ بیست ببوو و لە دیمانەیەك دا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە بەرپرسەکەی حکومەتی عێراقی وەسیی بووە، بەلاّم ئەگەر تەماشا بکەین پلەی وەسیی لە حکومەتی عێراقی لە مێژووی دامەزراندنی

- **یانەی هۆشیاری:**

لە ڕاستیدا ئەو یانەیە نەهاتە دامەزراندن، بەڵکو لە هاوینی ١٩٢٦ ژمارەیەك لە گەورە پیاوانی ڕەواندز لە وانە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی، سەید تەهای نەهری، ئەمین ئەفەندیو محەمەد ئەفەندی بەڕێوەبەری دارایی لە ڕەواندز پێشنیاری کردنەوەی ئەو یانەیەیان لە ماڵی ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی بە حکومەت دا، بەڵام لە لایەن وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی عیراقییەوە داواکاریەکەیان ڕەت کرایەوە[٤٢]. لە بەر ئەوەی لە داواکاریەکەیان دا هاتبوو:

١- ناوی یانەکە( هۆشیاری) یە کەمانای –کۆمەڵایەتییە( هۆشیاری مانای الوعي-التوعیة- دەگرێتەوە نەك کۆمەڵایەتی- توێژەر) ئەو یانەیە هەوڵی چاککردنی زمانی کوردی دەدات لە ڕێی خوێندنەوە، بە هیچ جۆرێ لە بواری سیاسییدا کار ناکات.

٢-لە هەر شوێنێك ئەندامانی زۆر بوون لقی یانەکە دەکرێتەوە.

٣-مەڵبەند و لقی ئەو یانەیە لەم فەرمانبەرانە پێك دێ.

أ- سەرۆك – دوو دەنگی دەبێ.

ب- جێگری سەرۆك.

---

ئەو کۆمەڵەیەدا نەبووە، بۆیە ڕەنگە باوکی لە کاتی گێڕانەوەی مەسەلەکە کەوتبێتە هەڵەوە و ڕووداوەکەی تێکەڵاو کردبێ، یاخود وەسیی لەوکاتەدا لە پلەیەکیتری حکومەتدا بووە، یاخود هەر وەسیی نەبووە بەڵکو بەرپرسێکیتری حکومەت بووە. دیمانەیەك لەگەڵ ئازاد جوندیانی بەرپرسی دەزگای ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ٩ی حوزەیرانی٢٠٠٥ ، سلێمانی.

(٤٢) د. ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٥؛ دیڤید ماکداول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، ل ٣٦٦.

ج-ئەندامانی کارگێڕی کە دەبێ سوێندی یانە بخۆن[٤٣] بۆ ئەوەی لە پێناوی زیاد کردنی ئیش‌و کارو چالاکییەکانی یانەکەدا کار دەکەن، ئەمانە داواکانیان بە سەر زارەکی یان بە نووسین هەموو مانگێك بۆ سەرۆك نوێ دەکەنەوە.

د-ئەوانەی سوێند ناخۆن، دەبێ کۆمەکی مادی پێشکەش بە یانە بکەن.

٤-سالانە لە بارەگای یانە •کۆبوونەوەیەکی گشتی دەکرێ، دەتوانرێت کۆبوونەوەیەکی لەناکاوی گشتیش بکرێ.

٥-ئەگەر بینرا کە کۆمەڵەو یانەیەکی هاوئامانج لە شوێنێکی‌تردا هەبێ، ئەوا یانەی (هۆشیاری) دەتوانێ لەگەڵیاندا بەشداری لە چالاکییەکانیدا بکات.

ئیتر هەر لە ئەنجامی ئەو پێڕۆ و پرۆگرامە تۆکمەیەی یانەکە بوو ڕاپۆرتێکی بریتانی مەترسی لە کرنەوەی ئەو جۆرە یانەو کۆمەڵانە دەربڕیوە[٤٤]. لێرەدا ڕەنگە هۆکاری مەترسی دەسەڵاتدارانی حکومەتی عیراقی و بریتانی لە دامەزراندنی یانەی هۆشیاری لەو کەسانەوە هاتبێ کە یادداشتەکەیان پێشکەش کردووە، یا لە ناوەکەیەوە، لە بەر ئەوەی بە هۆشیار بوونەوەی کۆمەڵانی خەڵك، کارە دزێوەکانی ئەوان دیار دەکەت و خەڵکی بەروویان هەڵدەگەڕانەوە.

---

(٤٣) سەبارەت بە ناوەرۆکی سوێندەکە ئەوا سەرچاوەکان باسی لێوە ناکەن، بەلاَم ڕەنگە لە ناوەرۆکی سوێندی کومەڵەو یانەکانی‌تر جیاواز نەبێت کە سوێندیان بە قورئان و ئالاَی کوردستان و خەنجەری کوردی دەخوارد.

(٤٤) د. ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.

- **یانەی سەرکەوتن:**

کوردە ناودارەکانی دانیشتووی شاری بەغدا بە دەست پێشخەریی مەعروف چیاووك لە سەر ئەوە ڕێکەوتن کە لە ٩ی شوباتی ١٩٣٠ یاداشتێك پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی عیراقی بکەن بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی کردنەوەی یانەیەك بۆ کوردەکان. ئیتر لە دوای هەوڵو کۆششێکی زۆرو ماوەیەکی زۆر وەزارەتی ناوخۆ بە نووسراوی ژمارە( ٦٨٩٥) لە٢٠ی مایسی ١٩٣٠ بڕیاری کردنەوەی یانەکەی‌داو مافی ئیمتیازیشی بە مەعروف چیاووك دا[٤٥].

دەرئەنجام لە ڕۆژی ٣٠ی مایسی ١٩٣٠ لە ڕێو ڕەسمێکی فراوان و بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆری جەماوەری لە گشت چینو توێژاڵەکانی کۆمەڵ لە سینەمای ڕۆیاڵ لە شاری بەغدا یانەی سەرکەوتن کرایەوەو، لە هەڵبژاردنێکی دیموکراتیانە دەستەی بەڕێوەبردنی یانەکە هەڵبژێردران کە پێك هاتبوون لە: ئیبراهیم حەیدەری سەرۆکی یانە، مەعروف چیاووك باوەڕپێکراوی یانەو، ئەندامیەتی محەمەد ئەمین زەکی، مەحموود جەودەت، ئەحمەد ئاغای کەرکوکی، عەبدوڵڵا لوتفی، خەلەف شەوقی داودیو محەمەد عارف ئەفەندی[٤٦]. ئامانجی یانەی سەرکەوتن پێشکەش کردنی

---

(٤٥) ئەحمەد باوەڕ، کۆمەڵەی یانەی سەرکەوتن، چاپی یەکەم، چاپخانەی و ئۆفسێتی تیشك، کەلار، ٢٠٠٤، ل ٦٤.

(٤٦) ئەحمەد باوەڕ، کوردستان وچالاکی کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان لە سالانی ئینتدابی بەریتانیادا ١٩٢٠-١٩٣٢، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٨،ل ل٤٦-٤٧؛ غفور میرزا کریم، کردنەوەی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا چۆن لە سلێمانی دەنگی دایەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە(٩٨)، ١٩٩٣، ل ٦٢. بەپێی پەیڕەوی یانە هەر نۆمانگ جارێك یانەی سەرکەوتن ئەندامانی خۆی تازە دەکردەوە، ئەوەتە لە ٣ی

خزمەتگوزاری بوو بۆ ئەو کوردانەی کە سەردانی شاری بەغدایان دەکرد، لەگەڵ هاوکاریو کارئاسانی بۆ قوتابیانی کورد کە دەهاتنە بەغدا بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن، ئەوە سەرەڕای بەستنی کۆڕو سیمیناری هەفتانە[٤٧].

شیاوی باسە لە پەیڕەوی ناوخۆی یانەی سەرکەوتن دا هاتبوو کە یانە لەگەڵ سیاسەتدا تێکەڵاو نابێت، بەڵام بە تێپەر بوونی کاتو هاتنە ناوەوەی ئەندامانی تازە کار بەو خاڵە نەکراو لای دا بەلای کاری سیاسییەوە[٤٨]. هەر بۆیە لە لایەك کەوتە یارمەتی دانی کۆمەڵەی خۆیبوونو[٤٩]، لە لایەکی دیکەوەش هەوڵدان بۆ یەکخستنی خەباتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لە نێوان بادینانو سۆران[٥٠]. ئەگەرچی لەو هەوڵدانەیاندا سەرکەتوو نەبوو بە هۆی ئاشکرا بوونیان لە لایەن لێپرسراوانی حکومەتەوە، کەچی کارەکەیان گرنگی خۆی هەبووە، لەبەر ئەوەی بە گرێدانی خەباتی هەر دوو بەشی بادینان و

---

نیسانی١٩٣١ جارێکیتریش هەڵبژاردن کرایەوە ئەمانە هەڵبژێردران: ئەمین زەکی بەگ سەرۆك، مەعروف چیاووك، ئەحمەد ئەفەندی هەولێری، عەبدوڵلا عەلی ئاغا، ئەمین ڕەواندزی و ژمارەیەکی دی. شاکر فەتاح، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٢.

(٤٧) د. ئیسماعیل شوکر ڕەسول، ڕۆڵی رامیاری و ڕۆشنبیری مەعروف چیاووك، ل ١٤.

(٤٨) غفور رشید داراغا، یانەی سەرکەوتنی کوردان و چەند دێڕێك، گۆڤاری دەنگی مامۆستا، ژمارە( ١) حوزەیرانی ١٩٧٢، ل ١٧.

(٤٩) عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، گەشتێك بە کۆماری مەهابادا، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٧. ←

(٥٠) عەلائەدین سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢.

سۆران هێزێکی بەرگری زۆری بۆ کورد دادەمەزراندو ئاستەنگێکی گەورەی بۆ حکومەت دەنایەوە[٥١].

ماوە بڵێین سەدای کردنەوەی یانەی سەرکەوتن لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان دەنگی دایەوە لە ڕێگای ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا، هەر بۆیە زاری کرمانجی لە ژمارە( ٢٣)دا ئاماژەی بۆ کردنەوەی یانەکە کردووە لەگەڵ تەواوی ئامانج و بەرنامەکانی[٥٢]. هەروەها ڕۆژنامەی ئەل ئەحراریش( بەیروت) لە ژمارە( ١٤٨٧)دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە یانەی سەرکەوتن بنکەیەکی سەرەکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانە لە تورکیا، سوریا، عیراق‌و ئێرانداو کار بۆ ڕزگار کردنی کوردستان‌و هێنانەدی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ دەکات[٥٣]. یانەی سەرکەوتن لە کارەکانیدا بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو، بەوەش ڕۆڵ‌و جێ پەنجەی دیاری خۆی لە سەر ڕەوتی خەباتی کوردی نواند.

- پارتی پێشکەوتن( حزب التقدم):

پارتی پێشکەوتن لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ لە سەر دەستی عەبدولموحسن سەعدون (١٨٨٠-١٩٢٩) وەکو پارتێکی حکومی‌و یەکەمین پارتی پەرلەمانی لە عیراق بە شێوەیەکی ئاشکرا هاتە دامەزراندن، کە ئەندامانی تەنیا لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران‌و

---

(٥١) محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور، ڕۆڵی سیاسی و کەلتوریی ئەفسەرانی کورد لە بزاڤی کوردایەتی کوردستانی باشوردا (١٩٢١-١٩٤٥) چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٦٦.

(٥٢) زاری کرمانجی، ژمارە( ٢٣) حزیران ١٩٣٠، ل ١٣-١٦، سەرچاوەی پێشوو.

(٥٣) کۆنێ ڕەش، جمعیة خویبون، الطبعة الاولى، مؤسسة موکریان للطباعة و النشر، اربیل، ٢٠٠٠، ص ١٣١.

خاوەن پلەو پایە کارگێڕییەکان پێك هاتبوون(٥٤). هاو سۆزی سەرۆکی پارتی پێشکەوتن بۆ کوردو دانـنان بە مافەکانی کاریگەری کردە سەر ئەندامە کوردەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەران کە لە ساڵی ١٩٢٦ ببنە ئەندام لەو پارتە وەکو: ئیبراهیم یوسف، عەبدوڵلا موخلیس بەگ، شێخ حەبیب تاڵەبانی، نەشئەت ئیبراهیم ئەفەندی، ئیسماعیل بەگی ڕەواندزیو ئەوانی دی(٥٥). لێرەشدا لە بەڵگەنامەیەکی بریتانیدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە عەبدولموحسن سەعدونی سەرۆك وەزیرانی عیراق لەگەڵ هەر یازدە ئەندامە کوردەکەی ئەو پارتە کۆبۆتەوە لە شوباتی ١٩٢٦ و باسیان لە پێشکەش کردنی یاداشتێك کردووە کە پێشکەشی حکومەت کراوە سەبارەت بە زیاتر ساغ کردنەوەو دیاری کردنی عیراقی عەرەبیو کوردی، بەڵام هەر لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە کە لە هەوڵەکەیان سەرکەوتنیان بە دەست نەهێناوە، بەڵکو کۆسپی زیاتریان خستۆتە بەردەم کێشەی کوردی(٥٦). جێگای ئاماژە بۆ کردنە کە پارتی پێشکەوتن لە چالاکییەکانی بەردەوام بوو تا مارتی ١٩٣٠ لە سەر گۆڕەپانی سیاسیی عیراقیدا(٥٧).

---

(٥٤) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب السياسية العراقية دراسة تاريخية متواضعة عن الاحزاب السياسة التي تكونت في العراق بين العامين ١٩١٨-١٩٥٨، الطبعة الاولى، بيروت ، ١٩٨٠، ص ٨٥.

(٥٥) عبدالفتاح على يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص ٢٧.

(٥٦) نفس المصدر، ص ٩٣.

(٥٧) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب السياسية العراقية، ص ٩٣.

## - کۆمەڵەی بووژانەوەی قوتابخانەیی( جمعية النهضة المدرسية):

ئەو کۆمەڵەیە لە لایەن ژمارەیەك قوتابی بە هاوکاری مامۆستای مێژوو ئەنیس زەکەریا نسوولی لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاری مووسڵ بەسەرۆکایەتیی عەلی حەیدەر سلێمان[58] دامەزرا و ڕۆڵێکی

(٥٨) عەلی حەیدەر کوڕی سلێمان بەگ کوڕی عەلی بەگی سیلاحشۆڕە و لە ٤ی مارتی ١٩٠٥ لە ڕەواندز لە دایك بووە لە نەوەی میرانی سۆرانە. ناوبراو بە هۆی بەندکردنی باوکییەوە کە تۆمەتی کوشتنی ئەفسەرێکی عوسمانی کرابووە ئەستۆ لەگەڵ دایکیدا دەچێتە مووسڵ لای خزمەکانیان، بەلاّم دوای چوار ساڵ بەندی و ئازاد بوونی باوکی لەگەڵ دایکی دەگەڕێتەوە ڕەواندز. مانەوەی عەلی حەیدەر لە ڕەواندز زۆری پێناچێت، لە بەر ئەوەی ماڵی باپیرانی لە مووسڵ داوای ئەوەی لێدەکەن بچێتەوە ئەویّ لەگەڵ ئەواندا بژی. هەر بۆیە لە مووسڵ دەنێردرێتە بەر خوێندنی سەرەتایی، بەلاّم بە هۆی سەرهەڵدانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە خوێندن دادەبڕێت و دوای جەنگیش لە ١٩١٨ دەگەڕێتەوە ڕەواندز. کەچی جارێکیتریش دەچێتەوە مووسڵ و لە وێشەوە لەگەڵ باپیرەی دەچێتە حەلەب. بە گەڕانەوە بۆ مووسڵ دەست دەکاتەوە بە تەواوکردنی خوێندنەکەی و لە ساڵانی (١٩٢١- ١٩٢٢) خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات. لە قۆناغی ئامادەیی( کۆمەڵەی ڕابوونی قوتابخانەیی) دادەمەزرێنی، هەروەها لەگەڵ ئەوەش هەڵدەستیّ بە دامەزراندنی بازنەیەکی بچووك لە قوتابییان کە بلاّوکراوە لە ناو مووسڵ بلاّودەکەنەوە و نامە ئاراستەی ئەندامانی ئەنجومەنی دامەزراندن دەکەن. عەلی حەیدەر قۆناغی ئامادەیی بە پلەی یەکەم تەواو دەکات و ڕەوانەی زانکۆی ئەمەریکی لە لوبنان دەکرێت. لە لوبنان کۆمەڵەی قوتابییانی عێراقی کە قوتابیانی قۆناغی یەکەمین دروستیان کردبوو بۆ مەبەستی پارێزگاری لە ولاّت و ڕزگارکردن لەگەڵ یانەی (المنشیو العراقی). دوای تەواو کردنی قوتابیانی قۆناغی یەکەم عەلی حەیدەر سەرکردایەتی کۆمەڵەکە و یانەکە دەگرێتە ئەستۆ. ناوبراو دوای تەواو کردنی خوێندنی لە ١٩٣٠ دەگەڕێتەوە عێراق و ژمارەیەك پلە و پایە گرنگ لە ناو حکومەت وەردەگرێت و دواتریش خانەنشین دەکرێت تا لە١٠ی ئەیلولی ١٩٩١ لە بەغدا کۆچی دوایی دەکات. محمود شكحان الدليمي، علي حيدر سليمان، نشاطه الثقافي و دوره السياسي في العراق حتى العام ١٩٦٨، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية التربية جامعة بغداد، بغداد ، ٢٠٠٢؛ فەخری

کاریگەری بینی لە کاتی ڕاوەرگرتنەکەی کێشەی مووسڵ دا لەسەر لێژنەکەو خەڵکی ئەو شارەدا، کە جەختییان لە سەر ئەوە دەکردەوە مووسڵ بەشێکە لە عیراقو جیا نابێتەوە[٥٩].

---

سیلاحشۆڕ، ئاوڕێك لە نەزهەتی شاعیر و شاری ڕواندز، لە ژێر چاپکردندایە، ل ٢٨.

(٥٩) فؤاد حسين الوكيل، جماعة الاهالي في العراق ١٩٣٢-١٩٣٧، الطبعة الثالثة، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، ١٩٨٦، ص ٩٣؛ عبدالفتاح على البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل، ص ٦٩.

# تەوەری دووەم

## ڕۆڵ و چالاكیی ڕەواندزییەكان لە كۆمەڵەو ڕێكخراوەكانی قۆناغی یەكەمی سەربەخۆیی عیراقدا( ١٩٣٢ – ١٩٣٩ )

لە قۆناغی یەكەمی سەربەخۆیی عیراقی ژمارەیەك كۆمەڵەو ڕێكخراو لە كاری سیاسیی دابوون كە هەندێكیان درێژە پێدەری قۆناغی بەر لە خۆیان بوونو، هەندێكی‌تریش تازە دامەزرا بوون، جا بۆ ئەوەی ڕۆڵو چالاكییەكانی ڕەواندزییەكان لەو كۆمەڵەو ڕێكخراوانە ئاماژە بۆ بكەین یەكە یەكە باسیان لێوە دەكەین.

- كۆمەڵەی برایەتی:

كۆمەڵەی برایەتی لە سەر دەستی ژمارەیەك نیشتمانپەروەری كورد لە شاری سلێمانی بە شێوەیەكی نهێنی لە ساڵی ١٩٣٧ هاتە دامەزراندن[٦٠]، كە دەستەی دامەزرێنەرانی ئەو كۆمەڵەیە لە شێخ

---

(٦٠) سەبارەت بە مێژووی دامەزراندنی كۆمەڵەی برایەتی بیروڕای جیاواز و دژیەك لە سەرچاوە مێژوویەكاندا بەدی دەكرێت . لە وانە مەلا ئەسعەدی مەحوی ئاماژە بۆ مارتی ١٩٣٧ دەكات. كەریم زەند ئاماژە بۆ پایزی١٩٣٧ دەكات و نووری شاوەیسیش لە یاداشتەكانی ساڵی ١٩٣٨ بە ساڵی دامەزراندنی دادەنێت . مەلا ئەسعەد مەحوی، دیوانی ئەسعەد مەحوی، كۆكردنەوە و ئامادە كردن و لەسەر نووسینی: د. عەبدوڵلا ئاگرین، چاپی یەكەم، دەزگای چاپ و بلاْوكرنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٧؛ كەریم زەند، گەشتی زەند، چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤،ل ١٣٨؛ نوری شاویس، من مذكراتي، دون مكان و سنة الطبع، ص ١٦؛ كەیوان ئازاد ئەنوەر كۆمەڵەی برایەتی و حەمە ڕەشید خانی بانە، بەشی یەكەم، ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ، ژمارە (١٦٨٩) سلێمانی، ٢/٩/١٩٩٨، ل٦.

لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود جێگری سەرۆك، مەلا ئەسعەدی مەحوی کارگێڕی کۆمەڵەو جێگری دووەم، ئیسماعیل حەققی شاوەیس، محەمەد سەدیق شاوەیس، شێخ لەتیفی دانساز، حەمە بۆر، محەمەد ئەمین مەنگوڕیو چەندانیتر پێك هاتبوون[٦١]. کۆمەڵە لە پێناو هێنانەدی ئامانجەکانی بیروباوەڕی بە کاری سیاسییو لە هەمان کاتیش چەکداریش هەبوو، هەر بۆیە گەلێك کاری توندیو تیژی ئەنجامدا[٦٢]. لە بەر ئەوەی یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی کۆمەڵەی برایەتی ڕزگارکردنی کوردو کوردستان بوو[٦٣].

کاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵەی برایەتی لە سەرەتادا لە شاری سلێمانی قەتیس مابوو، بەلاّم بە تێپەربوونی کات لقی لە شارەکانی بەغداو کەرکوكو کۆیە کردەوە[٦٤]. هەروەها لە ڕێگای سەرکردەکانییەوە گەلێك نیشتمانپەروەری تریان خزاندە ڕیزەکانی کۆمەڵەکەوە بۆیە بە دوور نازانریّ کە لە ڕێگای ئیسماعیل حەققی شاوەیسەوە ئەمین ڕەواندزیو حوسێن حوزنی موکریانی هێنرابنە ڕیزەکانی کۆمەڵەی برایەتییەوە[٦٥]. ماوە بڵێین کۆمەڵەی برایەتی لە کارو چالاکییەکانی ماوەیەك بەردەوام بوو، بەلاّم بە هۆی ئاشکرابوونی لە لایەن حکومەت و پەراگەندەکردنی هەندێك لە ئەندامەکانی بۆ

---

(٦١) د. عبدالستار طاهر شريف، المصدر السابق، ص ٩٢؛ کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٠.

(٦٢) نوری شاويس، المصدر السابق، ص ١٦.

(٦٣) د. عبدالستار طاهر شريف، المصدر السابق، ص ٩٢.

(٦٤) فواد عارف، المصدر السابق، ص ١٣٦.

(٦٥) د. اسماعيل شكر رسول، اربيل... ، ص ١٣٤.

کاری کارگێڕی لە لایەك‌و، ناکۆکی ناوخۆی کۆمەڵە‌و هاتنە مەیدانی پارتی هیوا لە لایەکی دی کۆمەڵەی برایەتی لە کار خست[٦٦].

- کۆمەڵەی دارکەر[٦٧]:

بۆشایی کاری ڕێکخراوەیی سیاسیی لە کوردستان بە تایبەتی‌و تەوژمی بیری نەتەوەیی جیهانی بە گشتی هاندەری قوتابیانی قۆناغی ناوەندی‌و ئامادەیی بوو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەك تا لە ڕێگای ئەو کۆمەڵەوە مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان بە دەست بهێنن[٦٨]. لە بەر ئەوەی لەو کاتەدا قوتابیانی کورد لە قۆناغەکانی خوێندن مێژووی ئەوروپایان دەخوێند و کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەوە، بۆیە ئەوانیش کەوتنە خۆ تا بەشێوەی ئەوروپییەکان بتوانن لە ڕێگاری کاری ڕێکخراوەیی دەوڵەتێکی کوردستانی یەکگرتوو دابمەزرێنن[٦٩].

(٦٦) شیاوی باسە هەندێك لە ئەندامانی کۆمەڵەی برایەتی پێیان وایە کە کۆمەڵە تاساڵی ١٩٤٣-١٩٤٤ هەبوەو چالاکیی نواندوە. ئەسعەدی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨؛ نوری شاویس، المصدر السابق، ص ١٨؛ کەریم زەند، لە ژیانی وەزیفیمدا یەك ڕۆژ مۆڵەتم وەرنەگرتووە، گۆڤاری گلاوێژی نوێ ، سلێمانی، ژمارە( ١٥ )، ساڵی دووەم، ئابی ١٩٩٩، ل ٦٠.

(٦٧) دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی دارکەر لە ژێر کاریگەری ناوی کۆمەڵەی کاربۆناری ئیتالی ئەو ناوەیان لە کۆمەڵەکەیان نا. لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی کاربۆناری ئیتالی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لە ئیتالیا دامەزرابوو و، کاری بۆ ڕزگاری ئیتالیا لە دژی داگیرکەر دەکرد. ئەوانیش مێژووی ئەو کۆمەڵەیان خوێندبۆوە و کەوتبوونە سەر بیری ئەوەی بەشێوەی ئەوان کوردستان ڕزگار بکەن. نەجاتی عەبدولاّ، حزبی هیوا ١٩٣٩- ١٩٤٥ دوو ڕەوت، یەك کۆتایی، گۆڤاری رابوون، ژمارە( ٢٦ ) ، لەندەن، ١٩٩٩، ل ٥٩.

(٦٨) نوری شاویس، المصدر السابق، ص ١٨.

(٦٩) د. اسماعیل شکر رسول، اربیل... ، ص ١٣٤. دانانی کتێبە مێژووییەکان ژمارەیەك مامۆستا پێی هەڵدەستان و دەیان نووسیەوە لە وانە عەلی حەیدەر سلێمان دوای دەرچوونی لە خوێندنی و گەڕانەوەی بۆ عێراق دوو کتێبی بە ناوی

ئیتر هەر لە ئەنجامی ئەوانە بوو کۆمەڵەی دارکەر بە دەستپێشخەری‌و بیرۆکەی یوونس ڕەووف( دڵدار)[٧٠] و بە هاوکاری پۆلێك لە قوتابیانی قۆناغی دواناوەندی لە ساڵی ١٩٣٧ لە کەرکوك هاتە دامەزراندن[٧١]. کۆمەڵەی دارکەر ئەگەرچی پەیڕەوو پرۆگرامێکی نووسراوو داڕێژراوی نەبوو، بەڵام زوو توانی لقی خۆی لە

---

(مێژووی شارستانیەتی ئەورووپی) و (مێژووی ئەورووپای نوێ)وە نووسی. زبیر بلال اسماعیل، علی حیدر سلیمان من رواد الحركة الاصلاحية و الفكرية في العراق، مجلة زاگرۆس، العدد (١١)، ٢٧ تشرين الثاني/١٩٩٧، ص ٢٧.

(٧٠) یونس ڕەئوف( دڵداری شاعیر) لە بنەماڵەی خادم سەججادەی کەرکوکە و لە ساڵی ١٩١٧ لە کۆیە لە دایك بووە، هەر لە شاری کۆیە خوێندنی سەرەتایی تەواوکردووە، دواتریش خوێندنی ئامادەیی لە کەرکوك و کۆلیژی مافی لە شاری بەغدا تەواو کردووە. دڵدار خاوەنی سروودی( ئەی ڕەقیب )ە و، ڕۆڵی کاریگەری بینیوە تا لە ١١ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٨ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە. کریم شارەزا، المناضل القومي و الشاعر المجدد (دلدار) ١٩١٧-١٩٤٨، جريدة خەبات، العدد (١٠٠١) ١٠/ ١٠/ ٢٠٠٠.

(٧١) سەبارەت بە مێژوو و شوێنی دامەزراندنی کۆمەڵەی دارکەر زانیاری جیاواز و دژ بە یەك هەیە لە ناو سەرچاوە مێژوویەکاندا. سەرەتا سەرچاوەکان بە تێکڕا ساڵی ١٩٣٧ بە ساڵی دامەزراندنی کۆمەڵەی دارکەر دادەنێن ، بەڵام نووری شاوەیس لە یاداشتەکانی ئاماژە بۆ ساڵی ١٩٣٨ دەکات. سەبارەت بە بیرباوەڕە جیاکانی شوێنی دامەرزاندنیشی دابەش دەبن بۆ سێ گروپ. گروپی یەکەم دەڵێن لە شاری هەولێر دامەرزاوە. گروپی دووەم کە د. موکەرەم تاڵەبانی‌یە دەڵێت: لە شاری کەرکوك دامەزراوە. گروپی سێیەمیش شاری سلێمانی بە شوێنی دامەزراندنی دادەنێن. د.اسماعيل شكر رسول، اربيل ....، ص ١٣٤ومابعدها؛ صالح الحيدري، مختارات من مذكرات صالح الحيدري، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة الثقافة ، سليمانية، ٢٠٠٤، ص ١٩ ؛ نوری شاويس، المصدر السابق، ص ١٨؛ فيصل الدباغ، اضواء على كتاب...، ص ٦٩؛ د. موکەرەم تاڵەبانی، کۆمەڵەی دارکەر و پارتی هیوا چۆن دامەزران؟!!، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ( ٥٢)، بەغدا، ١٩٩٣، ل ل ١٨-٢٢؛ کریس کۆچیرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٠؛ نەجاتی عەبدوڵا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

شارەکانی کەرکوك، سلێمانی، کۆیە، کفری، شەقلاوە، چەمچەماڵ، بەغدا و خانەقین بکاتەوە[٧٢].

کۆمەڵەی دارکەر یەکەمین کۆنگرەی خۆی لە حوزەیرانی ١٩٣٨ لە باخچەی( ام الربیعین) لە شاری کەرکوك سازدا و، لە کۆنگرەکەدا بیری لە فراوان کردنی چالاکییەکانی کردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش ناوی هەندێ لە پیاوە ناودارەکانی کوردییان تاووتۆ کرد وەکو محەمەد ئەمین زەکی، مەعروف چیاووك و ڕەفیق حلمی تا بیکەن بە سەرۆکی کۆمەڵەکە[٧٣] . ئیتر لە ئەنجامی ئەوەدا ئەندامانی دارکەر بە تێکڕای دەنگ ڕازی بوون لە سەر ئەوەی کە پەیوەندی بە کەسایەتی ناودارو نیشتمانپەروەری کورد ڕەفیق حلمی‌یە وە بکرێت. کۆنگرەی ئەو جارەی کۆمەڵەی دارکەر بە ئامادەبوونی ڕەفیق حلمی لە هاوینە هەواری شەقلاوە لە بێستانی جەمیل میران[٧٤] دا بەستراو بڕیاری ئەوە درا کە

---

(٧٢) د. موکەڕەم تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩؛ نوری شاویس، المصدر السابق، ص ص ١٨-١٩.

(٧٣) د. موکەڕەم تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠-٢١.

(٧٤) جەمیل میران، کوڕی ڕەشید کوڕی مستەفا میرانە و، لە ساڵی ١٩٢٢ لە شەقلاوە لە دایك بووە. خوێندنی سەرەتایی هەر لەوێدا تەواو کردووە و دواتریش ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر و کەرکوك خوێندوە. ناوبراو ساڵی ١٩٤٥ کۆلێژی مافی لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە و دواتریش گەلێك پلەوپایەی کارگێڕی وەرگرتووە وەکو بەڕێوەبەری ناحیە و قائیمقامی شارۆچکە" تا لە ساڵی ١٩٦٣خانەنشین کراوە. جەمیل میران یەکێك بووە لە ئەندامانی دامەزرێنەری پارتی هیوا هەر بۆیە باخچەکەی خۆی بۆ تەرخان کردوون لە کاتی بەستنی یەکەمین کۆنگرەیان. ماوەبڵێین ناوبراو لە مانگی ئەیلولی ١٩٩٥ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە. دیمانەیەك لەگەڵ دکتۆر نیاز جەمیل میران پزیشك لە وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٢٤ی تەمووزی ٢٠٠٥، هەولێر.

پەرە بە کارەکانیان بدەنو ناوی کۆمەڵەی دارکەریش بە پارتی هیوا بگـــــــۆڕن[٧٥].

ئەگەرچی لە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ کردنەوەی لقی کۆمەڵەی دارکەرو چالاکییەکانی لە ڕەواندز نەکراوە. بەلاّم دوور نی‌یە کە لقی کۆمەڵەی دارکەرو چالاکییەکانی لە ڕەواندزیش هەبووبێت ، لە بەر ئەوەی قوتابیانی ڕەواندزیش بە چەشنی شوێنەکانی‌تر کە قوتابخانەی ناوەندی تیادا نەبوو، بۆیە دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتاییان ڕوویان لە شارەکانی هەولێرو کەرکوك دەکردو لە کاتی پشووی نیوەی ساڵو هاوینیشدا کە دەگەڕانەوە بیروباوەڕی ئەو ناوچانەیان بۆ ڕەواندز دەگوێزایەوە کە هەر وەکو لە دواتردا لە پارتی هیواش لێیان دەبینین.

- پارتی هیوا:

دوای ئەوەی ئەندامانی دارکەر هاتنە سەر بیری فراوان کردنی ڕێکخستەکانیانو ناوی کۆمەڵەکەیان گۆڕی بە ناوی پارتی هیواوە[٧٦] . ئیــتر ئەو پارتە لە سەر پاشماوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵـــــەی دارکەرەوە لە ساڵی ١٩٣٩ هاتە دامەزراندن[٧٧].

---

(٧٥) فیصل الدباغ، اضواء علی کتاب...، ص ٧٢. شـیاوی باسـە لێرەدا نـووری شاوەیس سەبارەت بە شوێنی بەستنی ئەو کۆنگرەیە بـیروڕای جیـاوازی هەیـە کـە دەڵێـت: لـە یـەکێك لـە ئوتێلـەکانی شـاری کـەرکوك بەسـترا. نـوری شـاویس، المصدرالسابق، ص ٢١.

(٧٦) ناوی کۆمەڵەکەیان ناونا بە ناوی کۆمەڵەی( هێڤی)یەوە کە یـەکێك بـوو لـەو کۆمەڵە سیاسیانەی لە سـاڵی ١٩١٠ پۆلێـك قوتابیـانی کـورد لـە ئەسـتەمبۆل دایانمەزراند. بۆ زیاتر زانیاری لـە سـەر کۆمەڵـەی هێڤـی بڕوانـە: بلـەچ شـێرکۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١؛ د. عبدالستار طاهر شریف، المصدر السابق، ص٣٨.

(٧٧) سەبارەت بە مێژووی دامەزراندنی پارتی هیوا بیروڕای جیاواز هەن، هەنـدێك بـۆ ساڵی ١٩٣٧ی دەبەنەوە. هەندێکی‌تر بۆ ساڵی ١٩٣٨، ئەوانـەی تـریش بـۆ سـاڵی ١٩٣٩ و ١٩٤١ی دەبنـەوە. د. عبدالســتار طـاهر شـریف، تـاریخ الحـزب الشوري

پارتی هیوا وەکو تاکە پارتێکی سیاسیی سەر گۆڕەپانی سیاسیی ئەو کاتە لە باشووری کوردستان هەر زوو توانی پەرە بە ڕێکخستنەکانی خۆی بداتو سەرجەم چینو توێژاڵە جیاجیاکانی کۆمەڵ لە پارێزەر، مامۆستا، پزیشك، ئەفسەر، سەربازو ژمارەیەك سەرۆك هۆزی کوردی لە خۆی کۆبکاتەوە کە دەتوانیین ناوی ئەوانە بهێنین: ڕەفیق حیلمی، تۆفیق وەهبی، مەعروف چیاووك، ئەمین ڕەواندزی، ئیسماعیل حەققی شاوەیس، عزەت عەبدولعەزیز[٧٨]، مستەفا خۆشناو[٧٩]، محەمەد قودسی[٨٠] ماجید مستەفا، شێخ

---

الکردستانی، بغداد، ١٩٧٨، ص ص ١٦-١٧؛ کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٠؛ نوری شاویس، المصدر السابق، ص ٢٠-٢١؛ د.موکرم طالبانی، حزبی هیوا، ص ص ٥١-٥٢؛ تاریق جامباز، لاپەرەیەکی شاراوە لە مێژووی (حزبی هیوا) لە هەولێر، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە( ١) ، ئابی ١٩٩٧، ل ل ٢٥-٣١.

(٧٨) عزەت عەبدولعەزیز، لەساڵی ١٩١١ لە ئامێدی لە دایك بووە و چۆتە ڕیزی سوپای عێراقی تا پلەی سەربازی بەرز بۆتەوە بۆ ڕەئیس ڕوکنی یەکەم، ناوبراو ئەندامی پارتی هیوا بووە و، بەشداری لە شۆڕشی (١٩٤٣-١٩٤٥)ی بارزان کردووە و ئەندامی هەیئەتی ئازادی بووە. پاشان لە تەك مستەفا بارزانی چۆتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەشداربووە لە کۆماری کوردستان. دوای گەڕانەوەشی بۆ عێراق بەندکراوە، کە سەرئەنجام لەگەڵ هەر سێ هاوڕێکەیتری مستەفا خۆشناو، خەیروڵلا عەبدولکەریم، محەمەد قودسی لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لە سێدارە دراون. فەیسەڵ دەباغ، حزبی "هیوا" و شۆڕشی " ١٩٤٣-١٩٤٥" ی بارزان، چاپی یەکەم، بلاۆکردنەوەی دەزگای ڕاگەیاندنی گولان، هەولێر ١٩٩٧، ل ل ٢٧،٥٨،٧٦،٨٠،١٢٤.

(٧٩) مستەفا خۆشناو، لە ساڵی ١٩١٢ لە بێتواتە لە دایك بووە، لە تەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، لای کەریم ئاغای واجید ئاغای حەوێزی پەروەردەکراوە. ناوبراو ئەندامی پارتی هیوا بووە دواتریش بەشداری لە شۆڕشی (١٩٣٤-١٩٤٥)ی بارزان کردووە، لە پاشانیش چۆتە ڕیزی هێزی کۆماری کوردستان و بە شداریی لەشەڕەکاندا کردووە تا ئەوەی کۆتایی بە کۆمار هاتووەو گەڕاوەتەوە عێراق و بەندکراوە، کە سەرئەنجام لەگەڵ هەر سێ هاوڕێکەیتری عزەت

عەبدولقادر بەرزنجیو زۆر کەسی دیکە[81]. هەروەها پارتی هیوا سەرکەوتنی بەر چاوی بە دەست هێنا لە کردنەوەی لقەکانی لە شارو شارۆچکەکانداو تەنانەت پەلی بۆ شاری بەغدای پایتەختو پارچەکانی دیکەی کوردستانیش نا[82].

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە باسی لێوە بکەین ڕۆڵ و چالاکی ڕەواندزییەکانە لە پارتی هیوا دا کە بیرو بۆ چوونو ڕێکخستنەکانی لە ڕێگای قوتابییانەوە لە هەولێرو شارەکانی دیکە بۆ ئـــــەوێ دەگوازرایەوە[83]. هەر بۆیە لەو ناوچەیەشدا لقێکی پارتی هیوا لە ١٩٣٩ کرایەوە و دەستی بە کارەکانی کردووە کە چین و توێژاڵێکی زۆری ڕەواندزی لە خۆی کۆکردۆتەوە و لە لایەن سەعدوڵلا وە سەرپەرشتی کراوە کە ئەندامەکانی پێك هاتبوون لــــــە: ئەمین

---

عەبدولعزیز، خەیروڵلا عەبدولکەریم، محەمەد قودسی لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لە سێدارە دراون. محەمەد عەبدوڵلا کاکە سوور، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٦.

(٨٠) محەمەد مەحمود قودسی، لە ساڵی ١٩٢٢ لە قودس لـە دایـك بـووە هـەر بۆیـە نازناوی قودسی خراوەتە پاڵناوی، لەگەڵ دامەزراندانی پارتی هیـوا بۆتـە ئەنـدام، ساڵی ١٩٤١ بۆتە جێگری ئەفسەری ئیعاشـە و بەشـداری لـە شۆڕشـی( ١٩٤٣-١٩٤٥ )ی بارزان کردووە، لە پاشان چۆتە پاڵ هێزەکانی کۆماری کوردسـتان. دوای گەڕانەوەشی بۆ عێراق بەنـد دەکرێـت و لەگـەڵ هەرسـێ لـە هـەڤالانی مسـتەفا خۆشناو، عزەت عەبدولعزیز، خەیروڵلا عەبدولکەریم لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لە بەغدا لە سێدارە دەدرێن. محەمەد عەبدوڵلا کاکە سوور، هەمان سەرچاوە، ل ١٤٦.

(٨١) د. اسماعيل شكر رسول، اربيل...، ص ١٣٧؛ منذر الموصلي، الحيـاة السياسـية و الحزبية في كردستان، لندن، ١٩٩١، ص ٢٦٢.

(٨٢) نەجاتی عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠.

(٨٣) تاریق جامباز، وشیاری نەتەوایەتی گـەنجانی هـەولێر لـە کۆتـایی سییەکان و ناوەڕاستی چلەکان لە نێو حزبی هیوا دا، گۆڤاری هـەولێر ژمـارە ( ١)، هـەولێر، زستانی١٩٩٨، ل ٥٧-٦٦.

**ڕەواندزی، میر محەمەد ئەمین دەرگەڵەیی، شێخ سلێمان مستەفا، عەبـــدولـــوەهاب محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی، ئەحمەد محەمەد عەلی ئاغای جوندیانی، مامۆستا جەلال سەعید خەیلانی، ئیبراهیم حەسەن، سەبری نەجیب نەورۆز ئەفـــەندی[٨٤]، عـــەلی عـــەبدوڵـــلا(عەلی مەکتەبە)[٨٥]، یوسف ڕەشید ئاغای کاولۆکان**

---

(٨٤) سەبری نەجیب نەورۆز ئەفەندی: لە ساڵی ١٩٢١ لە ڕەواندز لە دایك بووە و لە بنەماڵەی حاجی نەورۆز ئەفەندییە کە دەگەڕێنەوە بۆ نەوەی وەستا ڕەجەبی دروستکەری تۆپەکانی سەردەمی میر محەمەد پاشای ڕەواندزی( ١٨١٣-١٨٣٦) . ناوبراو خوێندنی سەرەتایی لە ڕەواندز تەواو کردووە و دواتریش ڕووی کردۆتە شاری هەولێر. لە شاری هەولێر دەچێتە ڕیزی ڕێکخستنەکانی پارتی هیواوە و ئەندامێکی کارای ئەو پارتە بووە لە ڕەواندز. دوای هەڵوەشانەوەی پارتی هیوا ١٩٤٥ دەبێتە ئەندامی پارتی ڕزگاری و لە پاشانیش پارتی دیموکراتی کورد. ساڵی ١٩٤٨ بە سەفەرێك ڕوودەکاتە وڵاتی میسر و لە ڕێگادا چاوی بە قەدری جانی شاعیر و بنەماڵەی بەدرخانییەکان دەکەوێت. لە کاتی گەڕانەوەشی دیارە ژمارەیەك بڵاوکراوە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ، بەڵام ئەوەی یارمەتی دەری دەبێت بۆ دەرباز بوونی ئەو بڵاوکراوانە، بوونی گەردەلوولێکی زۆر دەبێت لەو ڕۆژەدا لە شاری بەغدا. ساڵی ١٩٥٩ بە هۆی کاری سیاسییەوە بەند دەکرێت و ڕەوانەی بەندیخانەی نوگرە سەلمان دەکرێت و ماڵەکەشی بۆ خوارووی عێراق دەگوازرێتەوە. بەڵام دوای بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ دەگەڕێتەوە ڕەواندز و بە هۆی کاری میرییەوە ڕەوانەی ناحیەی گەلاڵە دەکرێت ، ئیتر لە سەر کارەکەی بەردەوام دەبێت تا خانەنشینی. ناوبراو دوای خانەنشینی وەکو کەسایەتییەکی ناسراوی شارەکە لە ڕەواندز دەمێنێتەوە تا لە ١٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠١ کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی گەردەگەرد لە شاری ڕەواندز بە خاك دەسپێردرێت. دیمانەیەك لەگەڵ سالار سەبری نەجیب نەورۆز ئەفەندی لە ١٨ی حوزەیرانی٢٠٠٥، سۆران.

(٨٥) عەلی عەبدوڵلا ناسراو بە عەلی مەکتەبە لە کەسایەتییە ناودارەکانی ڕەواندزە کە ئەندامێکی کارای پارتی هیوا بووە هەر لە سەر ڕاسپاردەی پارتی هیواش ناوبراو لەگەڵ سەبری نەجیب ئەفەندی هەڵساون بە کردنەوەی کتێبخانەیەك لە ڕەواندز لە ٦ی شوباتی ١٩٤٣ بە ناوی سەرکەوتن و دواتریش لە سەر ڕاسپاردەی پیرەمێردی شاعیر ناویان گۆڕیوە بە پێشکەوتن. باوکیی هێلین، چاوپێکەوتن،

(وسوئاغا)[٨٦]، سامی ڕەواندزی ، سەید عومەر سەید ئەحمەد (سەیدا عومەر)، نەجات سەعید قادر، جەلال بەگی دەرگەڵەیی و چەندانی‌تر[٨٧].

ئەندامانی هیوا لە ڕەواندز هەڵساون بە دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی دەست نووس بە ناوی کوردستان کە لەو بڵاوکراوەیەدا ئاماژەیان بۆ شۆڕشەکانی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، شێخ سەعید، شێخ مەحموود و سمکۆی شکاک کردووە[٨٨]. هەر بۆیە دەتوانرێ بووترێ کە پارتی

---

گۆڤاری رواندز، ژمارە(١) ، ڕەواندز، نیسانی ١٩٩٨، ل ل ٥٩-٦١. عەلی مەکتەبە ئێستاکەش لە ژیان ماوە و لە ڕەواندز ژیان بە سەر دەبات لە سەردانێکمان بۆ ڕەواندز سەردانی ناوبراومان کرد تا دیمانەیەکی لەگەڵ ئەنجام بدەین، بەلام بە داخەوە بە هۆی توشبوونی ناوبراو بە نەخۆشی لە بیرچوونەوە نەیتوانی هیچ شتێکمان بۆ باس بکات کە ڕەنگە زانیاریەکانی لای ئەو کەلە پیاوە هەندێکی‌تری لە زانیاریەکانی نێو ئەو باسەی دەوڵمەندتر بکردایە.

(٨٦) یوسف ئاغای ڕەشید ئاغای کاولۆکان ناسراو بە وسوئاغا لە ساڵی ١٩١٦ لە کاولۆکان لە دایك بووە و لە خانەی مامۆستایانی ڕیفی لە شاری بەغدا وەرگیراوە، کەچی لە بەر چالاکی کاری سیاسیی و ڕێکخستن لە نێو پارتی هیواوە لە خوێندن دەرکراوە. شیاوی باسە ناوبراو چەندین جار لە ئاهەنگی نەورۆز لە گەردەگەرد لە ڕەواندز وتاری سیاسیی خوێندۆتەوە. لە ساڵی ١٩٥٦ وسو ئاغا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان کردووە تا کۆتایی شۆڕش. ناوبراو لە ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی گەردە گەرد لە شاری ڕەواندز بە خاك سپێردراوە. چالاك میرانی، ڕواندز قەلای خەبات و کوردایەتی" بزاڤی سیاسی، ڕۆڵی کەسایەتیەکان، ڕووداو و کارەساتەکان" ،چاپخانەی دیلان ، سلێمانی ، ٢٠٠٥، ل ٩٥.

(٨٧) طارق جامباز، ڕۆڵی ڕەواندزییەکان لە حیزبی هیوادا، گۆڤاری هەولێر، ژمارە( ٩) ، هەولێر، زستانی٢٠٠١، ل ل ٥٤-٥٩؛ دیمانەیەك لەگەڵ فەرهاد شاکر مەجرووم لە ٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٥ ئوتێل ئاشتی سلێمانی.

(٨٨) طارق جامباز ، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٥٤-٥٩؛ باوکیی هێلین، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٥٩-٦١.

هیوا له ڕەواندز ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوه له. هۆشیارکردنەوەی خەڵکی ناوچەکه له بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیِ کوردستان، تا لەو ڕێگایەوە هانیان بدات له پێناو هێنانه دی ئامانجه سەرەکییەکانی پارتی هیوا که هەوڵی بۆ دەدا. ماوه بڵێین پارتی هیوا له کارو چالاکییەکانی تاوەکو ساڵی ١٩٤٤بەردەوام بوو، کەله و ساڵەدا دووچاری کەرت کەرت بوون هاتوو دواتریش بەیەکجارەکی ڕێکخستنەکانی هەڵوەشایەوە.

- کۆمەڵەی برایەتی نیشتمانی( جمعية الاخاء الوطني):

له دەرئەنجامی بەستنی پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٠ عیراقی بریتانیو پەسند کردنی له لایەن حکومەتەوە، ژمارەیەك له پیاوه ناودارەکانی عیراقی به مەبەستی دروست کردنی کۆمەڵەیەکی سیاسیی نەیاری حکومەت، یاداشتێکیان پێشکەش به وەزارەتی ناوخۆ کرد تا ڕەزامەندی له سەر دامەزراندنی کۆمەڵەی برایەتی نیشتمانی بدات. ئەوه بوو وەزارەتی ناوخۆ به نووسراوی ژماره( ١٥٤٣٥) له٢٠ی تەشرینی دووەمی١٩٣٠ ڕەزامەندی له سەر دامەزراندنیدا و، دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەش هەڵبژێردرا که له: ڕەشید عالی گەیلانی (١٨٩٣-١٩٦٥)، عەلی جەودەت ئەیوبی( ١٨٨٦-١٩٦٩)، دوکتۆر عەبدولئیلا حافز، یاسین هاشمی( ١٨٨٤-١٩٣٧)، حیکمەت سلێمان، محەمەد ئەمین زەکی، محەمەد ڕەزا شەبیبی، حاجی عبدولواحید سوکەر و سەید موحسن کوڕی تەبیغ پێك هاتبوون[٨٩].

---

(٨٩) عبالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب السياسية العراقية، ص ١١٠.

شیاوی باسە چالاکییەکانی ئەو کۆمەڵەیە بۆ ناوچەکانی کوردستان پەلی هاویشت. سەبارەت بە ڕەواندزیش ئەوا لە ڕێگای سلێمانی بەگی سیلاحشۆڕ باوکی عەلی حەیدەر کە سەردانی شاری بەغدای کردبوو چالاکییەکانی کۆمەڵەی برایەتی نیشتمانی بۆ ڕەواندز گوازرایەوە و، شێخ کاکەمینی سەران کرا بە بەرپرسی لقی کۆمەڵە لە ڕەواندز و ئەحمەد کەمالیش بە سکرتێر دانرا[٩٠]. لقی کۆمەڵە لە ڕەواندز توانی ژمارەیەکی زۆر لە هەموو چین و توێژاڵە جیاجیاکان لە ڕەواندز لە خۆی کۆبکاتەوە، بە هۆی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی ئەوە لە ناو خەڵك ئەگەر هەر کەسێك ببێتە ئەندام لەو کۆمەڵەیە ئەوا ئەو کەسە قەرزداربێت، ماڵی خەڵکی خواردبێت، پیاوی کوشتبێت، هەر شتێکی کردبێت ئەوا حکومەت و پۆلیس بۆیان نی‌یە ئەو کەسە بگرن‌و دادگایی بکەن. لەو بارەیەوە حوسێن حوزنی موکریانی وەکو شایەتحاڵێك لە یاداشتەکانی‌دا دەڵێ:" دەبێت ئەو فێر کردن و چاوڕاوەی لە ڕەواندز کرا لە هەولێر و جێگاکانی دیکەش کرابێت، دیارە میللەت نەزان و نەدیتەیە، چتی وای لە پیاوی گەورە، کە بیست بە ڕەحمەتی دەزانن و هەر یەك لە وانەش گوناهێکی هەر لێ ڕوداوە، یان دزی کردووە، یان قەرزدارە، یان دەیەوێت ماڵی خەڵك بخوات یان خوێندارە یان خوێناویە بۆ رزگاری‌و پەرەی کاری خۆی بە پۆل و دەستە دەستە داخلی حزب دەبوون هەتا لە ڕەواندز هیچ دارکێش‌و سەپان‌و ماست فرۆشەکانی دێهاتانیش نەما هاتبوونە ڕەواندزو داخل بە حزب ببوون، بەڵام تێگەیشتووو ئاغاو گەورەپیاوەکان گۆشەگیری چاوەنواڕی دوامینی ئەو کارە بوون، کە نەیاندەزانی چۆنەو چۆن بە پایان دەگات،

---

(٩٠) حسێن حوزنی موکریانی، بەرهەمەکانی، ل ٨.

تێکەڵ نەبوونیان جارێ پەسند کردبوو"[٩١]. واتە لێرە دەتوانرێ بووترێ، کە بەڕێوەبەرانی لقی کۆمەڵەی برایەتی نیشتمانی لە ڕەواندز تەنیا توانیویانە کە خەڵکی ڕەشۆکی ناوچەکە لە خۆیان کۆبکەنەوە. ئەگەر بزانیین ئەو هەموو خەڵکە لە دواتر بە یەك وتاری حوسێن حوزنی موکریانی پەرتەوازەیان کردووەو لە کۆمەڵە بونەتەوەو چالاکییەکانی لە ناوچەکە لە ناو چووە[٩٢]. کۆمەڵەی برایەتی نیشتمانی لە چالاکییەکانی تا ساڵی ١٩٣٥ بەردەوام بووەو ماوەتەوە[٩٣].

- کۆمەڵەی هەوڵدان بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری (جمعية السعي لمكافحة الامية):

ژمارەیەك لە قوتابیانی عیراقی کە لە بەیروت خوێندنیان تەواو کردبوو لە شاری بەغدا یەکتریان گرتەوە وەکو: عەبدولفەتاح ئیبراهیم، عەبدولقادر ئیسماعیل، حوسێن جەمیلو عەلی حەیدەر سلێمان. ئەمانە ڕێکەوتن لە سەر دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بە ناوی (ئەلئەهالی)یەوە[٩٤]. هەر بۆیە ئەو کۆمەڵەیە لە دواتر بە ناوی

---

(٩١) د. کوردستان موکریانی، روناکی، ل ٣٧ .

(٩٢) ، هەمان سەرچاوە، ل ٣٨-٣٩.

(٩٣) عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب السياسية العراقية، ص ١١٢.

(٩٤) ئەل ئەهالی ، ڕۆژنامەیەکی سیاسیی ڕۆژانە بوو کۆمەڵێك لاو دەریان دەکرد کە لە لایەن( حوسێن جەمیل)ی پارێزەرەوە سەرپەرشتی دەکرا، کە یەکەمین ژمارەی لە ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٣٢ دەرچوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الصحافة العراقية، الجزء الاول، مطبعة الزهراء، بغداد، ١٩٥٧، ص ٨٢.

ئەهالی ناویان دەرکرد. ئەندامانی ئەهالی ڕێکەوتن لە سەر دامەزراندنی(جمعية السعي لمكافحة الامية) کە یەکەمین کۆنگرەی خۆی لە ٢٥ی تەشرینی ١٩٣٣ گرێدا و دەستەی دامەزرێنەرانی لە جەعفەر ئەبو تەمەن، نەسرەت فارسی، کامل چادرچی، عەبدولفەتاح ئیبراهیم، عەلی حەیدەر سلێمان پێك هاتبوون[٩٥].

شیاوی باسە دواتر ناکۆکی کەوتە نێوان عەلی حەیدەر سلێمان‌و هەندێ ئەندامانی کۆمەڵەوە، لە بەر ئەوەی عەلی حەیدەر سلێمان لەو کاتەی کە مەلیك فەیسەڵ لە ساڵی ١٩٣٣ کۆچی دوایی کرد وتارێکی بڵاوکردوە کە بووە جێگای نارەزایی هەندێ لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە، چونکێ پێیان وابوو کە عەلی حەیدەر سلێمان مەدح‌و سەنای مەلیك فەیسەڵی کردووە[٩٦]. چالاکییەکانی(ئەهالی) تا ماوەیەکی زۆر لە سەر گۆڕەپانی سیاسیی عیراقدا هەر بەردەوام بوو.

- یانەی پێنووسی عیراقی( نادی القلم العراقي):

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی بەهاری ساڵی ١٩٣٤ ژمارەیەك لە دەستەبژێرانی شاری بەغدا لە ماڵی دوکتۆر محەمەد فازڵ کۆبوونەوە بە مەبەستی کردنەوەی یانەیەك وەکو لقێك لەو دەزگا ئەدەبی‌و ڕۆشنبیرییەی کە بەشێکی زۆری جیهانی گرتبۆوە. لەو کۆبونەوەیەشدا هەر یەك لە جەمیل سدقی زەهاوی، محەمەد ڕەزا شەبیبی،عەبدولکەریم ئەلئەزەری، مەجید خدوری، جەعفەر خەیات، عەلی حەیدەر سلێمان، تۆفیق وەهبی‌و بەهائەدین نوری ئامادەبوون.

---

(٩٥) فؤاد حسين الوكيل، المصدر السابق، ص ص ١٣٣-١٣٤.
(٩٦) فؤاد حسين الوكيل، نفس المصدر ، ص ١٣٧.

ئەنجام لە سەر ئەوە ڕێکەوتن کە یاداشتێك پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ بکەن‌و داوای ڕەزامەندی کرنەوەی یانەیەك بە ناوی یانەی پێنووسی عیراقی بکەنەوە. لە بەرانبەر دا وەزارەت ڕەزامەندی نیشانداو، یانەش کۆنگرەی یەکەمی خۆی گرێدا[٩٧]. ئەو یانەیە یەکەمین یانە بوو لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە چالاکی باشی نواند[٩٨].

---

(٩٧) د. معروف خزندار،المثقفون الكورد و نادي القلم العراقي، مجلة زاگرۆس، العدد(١٤)، اربيل، ٢٧ كانون الثاني ١٩٩٩، ص ص ٢٦-٢٧.

(٩٨) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی چالاکیی ئەم یانەیە بڕوانە:د. معروف خزندار، نفس المصدر، ص ٢٧.

## ئه نجام

له ئه‌نجامی لێکۆڵینه‌وه‌که‌دا گه‌یشتووینه‌ته ئه‌م خاڵانه‌ی خواره‌وه:

* سه‌رهه‌ڵدانی جه‌نگی یه‌که‌می جیهان(١٩١٤-١٩١٨) به گشتی‌و هاتنی سوپای ڕووسه‌کان به تایبه‌تی زه‌ره‌رو زیان‌و کاولکارییه‌کی زۆری به سه‌ر ڕه‌واندز دا هێناوه که بۆته هۆی له ناوچوونی ژماره‌یه‌کی زۆری دانیشتوانی ئه‌و شاره، ئه‌وه سه‌ره‌ڕای سووتاندنی خانووه‌کانیان‌و سڕینه‌وه‌ی ئاسه‌واری شاره‌که که له شوێنی کاولۆکانی ئێستاکه بووه.

* دوای کۆتایی هاتنی جه‌نگی یه‌که‌می جیهان‌و هاتنی ئینگلیزه‌کان بۆ ناوچه‌که تاڕاده‌یه‌ك باری ڕه‌واندز بوژاوه‌ته‌وه‌و ئاوه‌دانی به خۆیه‌وه بینیوه، له ڕێگای پێشکه‌ش کردنی یارمه‌تی‌و هاوکاری له لایه‌ن بریتانییه‌کانه‌وه.

* له سه‌رده‌می دوای جه‌نگه‌وه ڕه‌واندز وه‌کو پێگه‌یه‌کی سیاسیی کۆنینه جارێکی‌تریش ده‌بووژێته‌وه‌و ده‌بێته‌وه بنکه‌یه‌کی سیاسیی وه‌کو سه‌رده‌می میرنشینی سۆران.

* سه‌رهه‌ڵدانی ڕاپه‌ڕین له ناوچه‌که‌و ده‌رکردنی ئینگلیزه‌کان زیانی به ڕه‌واندز گه‌یاندوه، ئه‌گه‌ر بزانیین سورچییه‌کان له‌گه‌ڵ هاتنیان بۆ شاره‌که تالان‌و بڕینێکی زۆریان کردوه، به‌مه‌ش به دیار ده‌که‌وێت که ڕاپه‌ڕینه‌که هیچ ئامانجێکی نه‌بووه. ئه‌وه له لایه‌ك، له لایه‌کی دیکه‌وه‌ش هه‌ر له ئه‌نجامی ڕاپه‌ڕینه‌که بوو فڕۆکه‌کانی بریتانیا له

دژی ڕاپەڕیوان چەند جارێك ڕەواندزیان بۆردوومان کردوە و زەرەریان لە خەڵکی شارەکەداوە.

* هاتنەوەی تورکەکان بۆ ڕەواندز بە ڕەزامەندی و بانگێشتی خەڵکی ناوچەکە نیشانەی بێزاری خەڵکی ناوچەکە بوو لە سیاسەتی کاربەدەستانی ئینگلیز لە لایەك و بێ ئومێد بوونیان لە بەڵێنەکانیان لە لایەکی دیکەدا.

* پێگەی ڕەواندز گرنگییەکی زۆری لە پەڕاوێزی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی لۆزان دا بە خۆیەوە بینیوە، ئەگەر بزانیین بریتانییەکان و تورکەکان بە مافی ڕەوای خۆیان زانیوە دەسەڵاتیان بە سەر ناوچەکەدا هەبێت و لایەنی بەرانبەری بە ناحەق زانیوە.

* سەردەمی قائیمقامیەتی سەید تەهای نەهری( ١٩٢٣-١٩٢٩) قۆناغێکی پرشنگدارە لە مێژووی سیاسیی ڕەواندز، لە بەر ئەوەی زۆربەی زۆری ڕاپەڕیوان و شۆڕشگێڕان کاتێك سەرکەوتنیان بە دەست نەدەهێنا لە کارەکانیان، دەهاتنە ڕەواندز و لای ئەو پەنا دەدران. ئەوە سەرەڕای ئەوەی لەوێوە یارمەتیشیان بۆ ڕەوانە دەکرا.

* لەو ماوەیەدا ژمارەیەك کەڵە پیاو و کەسایەتی نیشتمانپەروەر لە ناوچەکە سەریان هەڵداوەو خزمەتێکی زۆری لایەنی کوردایەتییان کردووە، وەکو:( ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی، ئەمین ڕەواندزی، مەعروف چیاووك...هتد).

* دوژمنداریی نێوان بنەماڵەی ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و بنەماڵەی باویل ئاغا کە دوو بنەماڵەی بە ناوبانگی شارەکە بوون و ئینگلیزەکان لە دواوەی کارەکە بوون، کاریگەری زۆری کردە سەر ڕەوشی شارەکە کاتێك ئیسماعیل بەگ کوژرا و نووری باویل ئاغاش

کەوتە بەندیخانەوە، چونکە ئەگەر ئەو دووانە دوژمندار نەبونایەو هەوڵەکەنیان یەکخستایە رەنگە ئێستاکە مێژووی شاری ڕەواندز شێوەیەکی دیکە بوایە.

* ڕەوشی سیاسیی ڕەواندز لە قۆناغی یەکەمی سەربەخۆیی عیراقیدا جارێکیتر دەکەوێتەوە کزی، ئەویش لە لایەك بە هۆی لاوازی بزاڤی چەکداری لە ماوەیەداو ، لە لایەکی دیکەشدا لە دەرئەنجامی ئاژاوەو ململانێی ناوەخۆ و پاڵەپەستۆی دەسەڵاتدارانی ناوەندی بۆ سەر ئەو کەسانەی کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرا ڕۆڵی کارا لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان دا دەگێڕن.

## پاشکۆی ژماره( ١ )

## دەقی مەزبەتەی پێشکەش کراو بۆ حکومەتی عێراق لە لایەن شەمسەدەین بەگی سیلاحشۆرەوە

**(ئەو دووکمێنتە لە ئەرشیفی نامەکانی فەخری شەمسەدین بەگی سلاحشۆرە)**
**نامەیەکی سولویمان بەگی سیلاحشۆرە رواندزی بۆ دەوڵەتی تازە دروستکراوی عیراق واتە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی کە تێیدا داوای بوونی لیوای(پارێزگای) ڕواندز دەکات. نامەکە بە دەستخەتی خۆیەتی‌و بە کوردی نووسراوە لەسەر رینووسی ئەو سەردەم‌و لە لای باوکم پارێزابوو(مەبەست باوکی فەخرییە- توێژەر) دەقی نامەکەش بەو جۆرەیە:**

مەزبەتە بۆ بوونی لیوا
لە زەمانی عوسمانیەکان لە تاریخی ١٢٦٠(دەکاتە ١٨٤٤ی زایینی — توێژەر) کە عیراق یەك ویلایەت بوو قەزای رواندزیش هەر وەکو بەسرە موسل کەرکوك مەرکەزی لیوا بوو. لە پاشان لە تەشکیلاتی ئەخیر ئەخیر واقیعەن کرا بەیەکەمین قەزا فەقەت(تەنها- فەخری) لەبەر ئەهەمیەتی مەوقیعیەی حەتا ئیحتلال واقع بوو بەسیفەتی(شێوەی) لیوایەتی لە جیهەتی عەسکەریەی هەر باقی بوو ئەو خسووسەش حەقیقەتەو بە ئەوراق موسەبەتە سابیتە لە نوقتەئی سیاسی‌و ئیقتیسادی ئەهەمیەت‌و نەزاکەتی قەزای رواندز لە نەزەری عموومی دەولەتەکان بە شەهادەتی جوغرافیا سابیتە. مەوقیعی وەها موهیم‌و نازك لە دەرەجەی قەزا مانەوەی لە نوقاتی موتەعەدیدە بۆ حکومەتی موزەخەمان دەبیتە سەبەبی زەرەو زیان چونکی ئەگەرچی حکومەتی سابیقە بە قەدەری سەد سالیك لیرانە ئوتوری حوکمی کردووە. فەقەت ئەم حوکمەی بە تەتبیقاتی قانونیەو بە ئیجراکردنی نفووزیکی حاکمانە نەبووە، حەقیقەتەن بەدەست وەسەر داهینانی موتەغەلیبەکان‌و ئیجرای مەزالمی بێژمار لەسەر رەعیەت‌و ژێر دەستان بوو، هەر لەبەر ئەو بێئیداریەیان بوو کە هەر لەم حەوالیە بارزان سورچی‌و برادۆست پشتدەر لە حالیکی بێ ئیتاعەتی دووری حکومەتی موزەخەمان کرا کە حکومەت بۆ دامەزراندنی ئەو سەرکیشانە

موحتاجی قبولکردنی مەساریفاتیکی زۆر بووە. تەمەنا دەکەین کە حکومەتی خۆشەویستمان لەم نیزیکانە بە کەمالی عەدالەتو سەتوەتێکی تاهیرانە ئەو حەوالییەی بە تەمامی دەفەرمووێ. فەقەت بۆ تەقەرروری ئەمنیتو ئاسایش مەوقیعیکی وەها موهیم ئیسترحام دەکەین نەزەر وە ئەم مەزبەتەمان بفەموون ئەهەمییەتو نەزالەتی رواندز لە نوقتەی سیپاسیو جوغرافی سابیت موحەقەقە مادامێکی ئەم خسووسە حەقیقەتێکی لەحزە(محقه، کفه، لحزه) تەقریری ئەمنیەتو ئاسایش لە ئەم مەوقیعە موهیمە موتەوەقیفە کە حکومەت ئەهەمییەتیکی تەمامی پی ببەخشی، یەعنی حدوودی ئەسلییەی قەزا لە جیهەتی شیمال لە ناحیەی مزووری موحافیزەو لە جهەتی غەربی شیمال زابی کبیر بە حدوود تەعین یەعنی لە قەزای زیبار، بارزانو گوندەکانی علاوەی سەر قەزا بفەرموونو قەزاییکی تازە لە ناو ناحییەی شیروانی ژووری لە گوندی(بنێ) تەشکیل و لە ناحییەی مزووری(بەرۆژ)و لە جهەتی زێبار(بارزان)و لە جیهەتی برادۆست کانییەرەشو لە جیهەتی شیروان ژیری مێرگەسۆر بکرین بە مەرکەزی ناحییە، وە ناحییەی شەقلاوە بکری بە مەرکەزی قەزا. عەشیرەتی میر یوسفو مەحالی( محالی) پشتگلی(پشتگەلی) لەگەڵ شاورو ناودەشت عەلاوەی شەقلاوە بکرێن. لەم مەربوتانە دووناحییەی بۆ دیار بکرێ، وە رۆست بکرێ بە مەرکەزی قەزا، سیدەکان بکرێ بەناحییە، وە وەلاش بکری بە ناحییە، محالی ناودەشت رەبتی ناحییەی وەلاش بکرێ، رواندز بکرێ بە لیوا، ئەم سێ ٣ قەزایانە تابع بە لیوای رواندز بن هیچ( شوبهەی تیدانیە کە نوقتەیەکی سایسیو ئیداریو ئیقتیسادی موحسیناتێکی زۆر بە ئەهەمییەت بۆ حکومەت وە میلەت دەبەخشێ چونکە نفوزی تغلبکان(تەغەلوبەکان) نامێنیو واریدات تەزایود دەکا، میلەت لەگەڵ حکومەتی لە نوقتەی موتەقابیلەی حقوق موحیبەتبیان زیاد دەبی، تیجارەت فەلاحەت یەك بەیەك زیادەکا موقابیل بە تورك ئیران ئەجنەبییەکان دەبیتە قەلاییکی ئاسنو پولا ئیمەش راحەت دەبین، حکومەتیش لە مەساریفاتی فەزلەو بگرەو بکیش کە چیینەکان ئاسودە دەمینی. بۆ قبول ئەم تەلەبەمان ئەم مەزبەتەمان تەزنیمو تەقدیم کرد.

تەواو

## پاشکۆی ژمارە ( ٢ )

## نەخشەی کارگێڕیی ڕەواندز

بۆ دروست کردنی ئەم نەخشەیە بە دەست کارییەوە سوود لە:

د. احمد نجم الدين، احوال السكان في العراق، معهد البحوث و الدراسات العربية، مطبعة البجلاوي، ١٩٧٠. وەرگیراوە.

## پاشكۆی ژماره ( ٣ )

## دەقی نامەی پشكێنەری كارگێڕی بۆ سەيد تەها نەهری

الى حضرت سيد طه افندي

بموجب تبليغات الواردة من وزارة الداخلية في بغداد

قد تعين حضرتكم لوظيفة قائمقام قضاء الرواندز

العائدة للواء اربيل.

يلزم تعين مأموري العدلية والمالية والادارة والشرطة

بموجبها بيانه البرقية [illegible] ولكم الصلاحية

ان تصرفوا بموجب توزيعات البرقية الى [illegible] الاف

روبية كل شهر ولاجل تأسيس التشكيلات حكومة العامة

قد تقرر اعطاء ثلاثين الف روبية.

زيادة صلاحيتكم العدلية بعد تحت المخابرة ولوصل انه

عند قريبا نبلغكم بذلك وتعليمات السابرة القائمة الى وظيفتكم

٩/٥/٢٧

مفتش اداري

صادية Nizamdin

9/5/23

# پاشكۆی ژماره ( ٤ )

## دەقی بەیاننامەكەی تەموزی ١٩٣٠ی كۆمەڵی پشتیوان

K.P.K
1.7.1930

ك.پ.ك
١٩٣٠/٧/١

### بیاناتیك بۆ دوست و دوژمنان

مسئلەیكی جند غریبە هر حركتیكی ملی و وطن لە كوملیكی كورد ویا لە فردیكی كورد دابیینری بە تحریكی غـیرە نـاوبراوە... (وشـەیەك لێـرە روشـاوە) برامبر بەم تلقیاتە اسفی خۆی بیان ئەكات. همو فردیك و جماعتیك لازمـە بـاش بزانیت كورد مافی خۆی وەرئەگریت ئالتی هیچ كسیك و یاكتلەیك نیە. حقـوقی ملی ووطنـی خۆی وەكو اقـوامی سـائر و همـو ...(وشـەیەك لێـرە روشـاوە) و زمانیك لـە داواكـردن دواناكـەویت و بـو سـاندنی حقـی مشـروعەی بـە همـو موجودتیك تی ئەكوشی. محركی كورد (لورانس) و امثـالی لـورانس نیـە. كـورد: درسی عبرتی لە حالی حضرەتی خـوی وەرگرتـووە بـو ئەمـەی خـوی لـەم اسـار نەجات بدات بەهمو قوەتیكی خوی هەول ئەدات كورد لەم عصری بسـتەمە حـق خوارو و خوی بـە اسـیریك أزانیـت. لـەبر ئـەوە ئـەو دەسـتەی كـە بوجگركـاهی دریژكراوە وا ئەكریت بویری ئەو دەستتانە هەول ئەدات. برامبر بە دوستان دوستە برامبر بەدوژمنان خونخوارە. حركاتی ملی ووطن كورد نتیجەی سعی و تی‌كوشـین چند ضابطیكی وطنـبروەر نیە. همو فردیكی كورد لە مافی مشتركە و عند للزوم جان فیدای گەلك زورە. كورد خوی بە قـومیكی قهرەمـان ئـەزانیت أریـە وەكـو اقوامی تری اری زل و اسارەتی كس قبول ناكات. وچە ملیتیـك بـەقوت اساسـی كورد تیك نادات. تورك بەم همو قوەتەی خوی لە شمال تـی ئەكوشـیت اساسـاتی كوردی پی تیك نەدرا كەوابو . عراق بە زورە ملی ناتوانیت اساساتی كوردستانی جنوبی محو بكاتەوە كە همو كوشەیكی پر لـە پیـاوی تـی گەیشـتو وەطنبـەرورە.

وزرانی حاضره ئەم حقائقەی نسبیا درك كرد وهمو زیاتر تی گەیشتن ارزو ئەكریت . چونكی بە تصدیقی حقی مشروعەی كورد برایتی لەگل كورد ممكنه.

**ای رجالی بریتانیای گەورە:**هتاكەی گیو لە اه و انینی ملتی كورد ناگرین و درحق بە ملتی مظلومەی كورد لاقید امینەوە و حقی مشروعەی ئەم ملتە نجیبه بە غیرە انبخشن و افرادی ئەم كلتە لە حقوقیملی خویان محزوم ئەكەن و لە هێلانەی خویاندا بە كوشتنیان ئەدن. ملتی كورد لەگل ئەم همو بە لطف و مرحمتی ایوە دیسان وفاكارە. و درگای امید لە ایوە نابریت. ئەو حقوقەی كە عبصة الامم بەم ملتەی بخشیوە بوچی بە صورتیكی مشروع لە تطبیق كردن اهمال ئەكن. ئەگر روحی مدنیتان وایە ئەمە قیدی ناكات!...

**ای رجالی محرمەی عراق:** كورد قومیكە خوی لە عصری بسیتەمە بە قومیكی زوند وانیست و بۆ ژینیكی بە شرف بەهزارن وطنبوری فدای ئەم غایە مقدسە كردوە و لە كردندا دوام ئەكات ئەم روحی میلی ووطن لە افرادی نجیبەی عرب ابینن همو فردیكی كورد. برامبر بە وطن خوی بە عینی روح صحە. چی سائیقەكە ایوەی وەكو تورك ددانتان لە روحی كورد تیژ كردوە. لە جیاتی بو خوتان بو یكتی عرب تی بكوشن و تفاق و دنانبای لە شبە جزیرەی خوتان هل بگرن بە مقدراتی ملیتك یاری ئەكەن محو كردنەوە اساساتی ملتیك بە غایە ازانین لە مە جداً خطا ئەكەن. ئەو اقوامەی بە عصرها ایوەیان تمثل پی نكرا ایوە چۆن ملتیك لە عصرە دە تمثل پی ئەكەن. و ئەم فكرەی خوتان لازمە بە خطابیكی گەورە تلقی بكن ئەگر حز بە برایتی كورد ئەكن لازمە مانعی غایەی كورد نەبن. كورد غایكی ملی و مقدسی بو خوی تعقیب ئەكات. بەقسەی جند كاسە لیسیك برایك لە خوتان متاثر مكن نتیجە بە اوامری سری خوتان بدەن ئەم معروضاتة بەر هبرلیكی حقیقی بزانن.

ای كورد: گیو لە بیناتی كوملیخوت بگرە.

كورد

# پێرست

* ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر

* ساڵی ١٩٧٧ لە هەولێر لە دایکبووە.

* ساڵی ٢٠٠٠ بەشی مێژووی کوردی لە کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر تەواو کردووە.

* ساڵی ٢٠٠٥ بڕوانامەی ماستەری لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر وەرگرتووە.

* ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سەلاحەدین/ هەولێر.

* ئەندامی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستانە.

نرخی(٣٠٠٠)دینار